**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **دەقی قورئان و ئاسۆکانی نووسین**
- **نووسینی:** ئەدۆنیس
- **وەرگێڕانی:** ئومێد عوسمان
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** ئاسۆ مامزادە
- **ژمارەی سپاردن:** ١٦١٩
- **نرخ:** ٢٠٠٠
- **چاپی یەکەم ٢٠٠٨**
- **تیراژ:** ١٢٥٠
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٢٤١)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com



## پێرست

بنەچەکان ..... ١
سەرەتا لە نێوان دوورخراوەکاندا ..... ٣
دەقی قورئانی و ئاسۆکانی نووسین ..... ٧
پاشکۆ: پرسینەکان-تێڕامانەکان ..... ٢٥
**ئاراستەکان** ..... ٤١
شیعر و رۆشنبیریی ناشیعرگەرایی ..... ٤٣
ناوەکان ..... ٥٧
زمان و راستی ..... ٦٣
**لێپرسینەوەکان** ..... ٧١
پێشەکییەک بۆ رەخنەی نوێگەریی عەرەبی ..... ٧٣
داهاتووی شیعر، شیعری داهاتوو ..... ٩٦
یادەوەرییەکانی مێژووی شیعر ..... ١٠٣
یادەوەری ..... ١١٥
**ستایشکردنەکان** ..... ١١٩
ستایشکردن بە شیعر ..... ١٢١
مرۆڤ ، بێ شوێنە ..... ١٢٥
راوەستابوو، کاتیش پاسارییە و تێدەپەڕێ ..... ١٣٣
درۆ و راستگۆیی ..... ١٣٧
ئەلسیاب: پاش نیو سەدە لەدایکبوونی ..... ١٣٩
لەبارەی"سوریال"ەوە ..... ١٤٣
شیعر ژیانە ..... ١٤٦
وێنە ..... ١٤٨
شیعر و کفر ..... ١٥٢
تیلماسکە دەق ..... ١٥٩
ئاماژەکان ..... ١٦١
برایانی شیعر ..... ١٦٣

# سەرەتا لە نێوان دوورخراوەکاندا

-١-

لـەودەمـەی دایـک، کۆرپـەکـەی لـە رەحمیـدا چێـدەبێـت، بـەشـیعر دووریدەخاتەوە: ئەمە ئەو وێنە سیمبولییەی پەیوەندی ریالیستی نێوان شاعیری عەرەبی و زمانەکەیەتی.

خۆ ئەگەر ئەوەی تەورات لەبارەی هاجەر و ئیسماعیلەوە دەیلێت و ئـەوەش کـە قورئـان دووپاتیـدەکاتـەوە، وەربگـرین ئـەوا دایکایـەتـی و باوکایەتی و زمانیش هەر هەموویان بەلانی عەرەب زمانەوە لە تاراوگەدا لە دایکبوون.

بەم گوتەیە نیشتمان- دایک، کە عەرەب زمانن تاراوگەیە. کە وابوو لە سەرەتادا تاراوگەبووە.

-٢-

ئەمە بنەچـەی- ئەفسانە و زمانە. جا پەیامبەرایەتی ئیسلامیش لە ناوەوەرای ئەم بنەچەیەدا بۆ دەستپێکێکی تر دامەزراوە، کە زمانیشی لە تاراوگـەکـەی خـۆی دەرهێنـاوە و لـە نیـشتمانی سـرووش: ئاسـمان نیشتەجێکردووە.

سرووش - الوحی- دەستپێکی ئەویترە. پەیامێکە بۆ زەمین- تاراوگە، تاوەکو پاکژبێتەوە و دەربازی بێت و ببێتە هاوشێوەی ئاسمان. ئیتر بۆ مـرۆڤ بـەجێهێلـرا. بـەوپێیـەی خـەلیفـەیـە و بـە دووی ئـەو پـەیامبـەرە دەکەوێت کە سرووشی جاڕدا، بۆ ئەوەی رێبازی شیاو بە جێبەجێکردنی ئەوەی سرووش فێریدەکات، ببینێتەوە. بەم شێوەیە سرووش بۆ تەعالیم و رێوشوێن و رێکخستنەکان گۆڕدرا.

بەهەر هۆیەکیش بێت لە مومارەسە کردندا سەرکەوت. روانین لە سرووش بەو پێیەیی یاسا و رێسایە، واتە بەو وەسفەی سیستمێکە.





لەهەر سیستەمێکیشدا فۆرمێک لە فۆرمەکانی دوورخستنەوە هەیە. ئەمەش هەر لەبەر ئەوە نا، یاساغکردن و شیکارییە، بەڵکو دیسان لەبەر ئـەوەی جیاکـەرەوە و ئاراسـتـەی دیـاریکراوە، پـێش هـەمـوو ئـەمانـەش مرۆڤ لەناوەوەرای خۆیدا، دۆستایەتی تایبەتی دووردەخاتەوە تاوەکو لە دەرەوەرای گشتی دا بیچەسپێنێت.

بەم شێوەیە دەکرێت بوترێت ژیانی عـەرەبی لـەدەسـتپێکی تاراوگـەی ئاخاوتن و سیستمدا شیعر بووە. ئەفرێنەری عەرەبی رابردوو، داهـاتوو، هەموو جۆرەکانی دوورخستنەوە، سانسۆر، رێگرتن، دەرکردن، زیندانی کردن. کوشتنی ناسیوە.

-٤-

رەنگە لەوەدا ئەو روونکردنەوەیە بدۆزینەوە، کە چۆن ئەوەی دی بە چەشنی فـەریـاد رەسـی خوددە. ئـەویـدی رابردوو و ئاوێنە نییە بـەڵکو داهاتووە، خود بۆ منداڵێتی ناگەرێنێتەوە، بە واتایەکی دی بە ئاراسـتەی نادیار دەیبزوێنی، بە ئاراسـتەی ئەوەی کە نامۆیـە پێی. شیعریش لـەم پەیوەندییەدا لەگەڵ ئەویدی " بەهەشتی بزربوو "یان "چاخی زێرین" نییە، بـەڵکـە پێچـەوانـەیـە، پرسـیار بـە بـەردەوامـی بـەرەو پرسـیار دەچێت. هـاوجووتی ئـەویـدی دەبێـت، بـەو پێیـەی پرسـیارە لـەگـەڵ خـوددا و لـە تاراوگەی بەرسڤدا دەژی. بەم جۆرە ئەویدی بۆ خود رەگەزی چێبوونـە، رەگـەزی ئاشـکراکردنی مـەعریفییـە. هـەروەک ئـەوەی ئـەویـدی لـەم ئاراستەدا، رەهەندی پرسیارکەرە لە خود.

-٥-

ئەویدی، هەردەم لە ئەزموونی ئەفرانونگەرایی عـەرەبیدا ئامادەبووە. لـەو زمانـەی کـە ئـەفرێنـەری عـەرەبـی زمانـە زۆرەکـانی، دێرێن، نوێ، عەرەبی، شیعری پێدەنووسێت،"کۆ"ن بەشێوگی تاک. بەڵام کۆ فاکتەرێکی

ناوخۆیی و دەرەکی زمانی عەرەبییان گەیاندە قۆناغی نەگوتن یاخود قسەی بێسەروبەری: ئەمرۆی ئەفراندنی نییە، ئەوەی بە ئازادی دەگوترێت و ئەفراندن دەیسەلمێنی، بووەتە زمانی خامۆشی و خامۆشکردن و لاڵ بوون. نەهاتنە گۆ خولگەیەتی.

ئەوەش زیاد دەکەین، کە ئەویدی لێرەیە و لە بنەرەتدا خۆرئاواییە، کە ئەویش بەهۆی کۆفاکتەرێکەوە بووەتە جیاکەرە و پێوەند، کە لەوانەیە وابیبینی بۆ خۆی ئازادە لەسنووری خۆیدا، یاخود رەنگە ئەویدی وابیبینی، کە لێرەدا عەرەبییە لەبنەرەتدا کە جگە لە بەرسڤی پرسیارێکی تایبەت و دیاریکراو چیتر نییە، بەرسڤێک پێش وەخت دەیزانێت، چونکە هەر بۆخۆی ئامادەی کردووە بەپێی ئەندێشە و پێداویستی و بەرژەوەندی.

لەوەدا سەرنجی ئەوە دەدەین کە ئەفرێنەری عەرەبی نائامادەییەکی دووڕوویانە دەژی: لە خۆی و ئەویدیدا، لەنێوان دوو تاراوگەدا دەژی: تاراوگەی ناوەوەڕا و، تاراوگەی دەرەوەڕا یاخود بەگوتەی سارتەر، لەنێوان دوو دۆزەخدا: خود و ئەویدی.

نەمن منم و نە ئەویدیش
نائامادەیی و تاراوگە، هەردووکیان ئامادەن

-٦-

بۆ ئەوەی شاعیربم، واتە دەبێت هەست بکەم و نووسینیش بەردەوام بێت. ئەز هێشتا نەمنووسیوە، چونکە شیعر سوزدانی هەمیشەییە بە دەستپێک یاخود دەستپێکی هەمیشەییە. لەگەڵ ئەوەی واتا، تەنیا بە ئاخاوتن و لەمیانەیەوە نەبێت، نازانرێت ئەوا بوونم واتای نابێت ئەگەر نەتوانم ئاشکرای بکەم بە ئاخاوتن. لەم نێوانەدا، لەم هیوایەدا، لەم سوزدانەدا، شاعیری عەرەبی دەکۆشێت کە قسەبکات- مەبەستم لەوەی بنووسێت و دەستپێبکات، وەلێ چۆن بوو توانای بەرایی نێوان



دوورخراوەکان؟ بەرلەوەش، بەرایی چییە- بەتایبەتیش لە رۆشنبیرییەکدا کە لە تاراوگە و بە سەر تاراوگەدا دامەزراوە؟

دەپرسم بۆ ئەوەی بەتاساوی وەڵام بدەمەوە کە شیعر لەزمانی عەرەبیدا ئەوسا و ئیستاش بە هەوڵێک بۆ دامەزراندنی سەرەتایەک کە دانامەزرێت دەمێنێتەوە، بگرە پێدەچێت دامەزراندنی مەحال بێت. بەڵام شاعیری عەرەبی بەهێزی نووسین، خۆی، قەوارەکەی پالپێوە نراوە. هێزی شیعریش کە بە دیاری کراوی، ئامادەییە بۆ ئەوەی بژی و بنووسێت لە وەهمگیری ئامادەییدا، واتە لە وەهمی دامەزراندن دایە. کاتێکیش کە دەژی و دەنووسێت لەم وەهمەدا، بێتوانایە ئەگەر قسە لە وەهمێکی تر نەکات: ئازادی، دیموکراسییەت، مافی مرۆڤ..

دەڵێم: وەهم، چونکە تۆ ناتوانیت ئازاد یان دیموکراتخواز بیت، ئەگەر لەناوخودی خۆتدا بۆ خۆت نەبیت، بەپێی دەستەواژەی ئەلفارابی. مەسەلەی ئازادی و دیموکراسییەت بەلای شاعیری عەرەبییەوە لەبەئاگابوونی تاکگەرایی یاخود لە مومارەسەی تەواوی بۆ دیموکراسییەت و مافەکانی مرۆڤدا خۆی نابینێتەوە، هەر وەکو ئەوەی لەلای شاعیری خۆرئاوایی هەیە. بەواتایەکیتر لەوەدا خۆیدەبینێتەوە کە زیاتر لەپێشترە: بوون، لەدەرەوەی هەموو تاراوگە. کەواتە چلۆن لەمەڕ ئازادی و دیموکراسییەت و مافەکانی مرۆڤ بدوێم و منیش من نیم و لە خۆشمدا بۆ خۆم هەبوونم نییە و بۆ ئەوی تریش؟ چلۆن بدوێم و بوونی خۆشم تاراوگەیە، دوورخراوەیە لە نا (الله)ی دامەزرێنەر و دامەزراوەدا.

-٧-

هەنووکە زمانی دامەزراوێتی خود و ئەویدی نوقمدەکات و بنەماکانی ئازادی و دیموکراسییەت و مافەکانی مرۆڤ دەهەژێنی. زمانی مەرگ و لاوازییە. مەرگ جگە لەمەرگ چیتر نابینێ. خودی مردوو، ئەویتر هاوشێوەی خۆی: بەمردوویی دەبینێ. مەرگ، ئەمڕۆ تەنیا دروشممانە.

# دەقی قورئان و ئاسۆکانی نووسین

-١-

یەکەم ئاماژە بەوە دەکەم، کە من لە نووسینی قورئانی دەدوێم بەو پێیەی دەقێکی زمانەوانییە لە دەرەوەی هەموو رەهەندێکی ئایینی، بەتێروانین و مومارەسە: دەقێکە دەیخوێنینەوە، هەروەکو خوێندنەوەی دەقێکی ئەدەبی.

دووەم، ئاماژە بەوە دەکەم کە ناچمە ناو هیچ جۆرە پرسیار کردنێک لەبارەی ماوەی نێوان سرووش و جارِدانی و نووسینەوەی، هەروەها دابەزینیشی. لایەنی چۆنیەتی نووسینەوەی، کێ نووسییەتی، رەوشەکانی نووسینەوە، ئەو مشتومڕانەی لەبارەی هەموو ئەمانەوە کراون، دەخەمە لاوە.

سێیەم، هێما بەوە دەکەم، من ناچمە ناو مشتومڕی مێژوویی لەمەڕ ریزبەندی سوورەت یان دەقەکان: ئاخۆ بەپێی دابەزینی ریزبەند کراوە. هەروەها ناشچمە ناو ستراکچەری سوورەت و پێکهاتەی: ئاخۆ ئایەتی تێدایە کە لەماوەی جیاجیادا دابەزیبێت یان نا. خۆشم لە قەرەی بەرباسخستنی جیاوازی نێوان دابەزین و نووسینەوە نادەم.

چوارەم، ئیکتیفا بە ئاماژەدانی ئەوە دەکەم، کە دەقی قورئانی بە پچر پچر بە درێژایی بیست و سێ ساڵ دابەزیوە، بەپێی رووداو و



پێداویستییەکانی هەلومەرج. بەرلەوەی بنووسرێتەوە و لەکاتی نووسینەوەشیدا، هەروەها پێش ئەوەی ئەم نووسینەوەیە دوا فۆڕمی خۆی لە مەسحەفی عوسمانی سێیەم خەلیفەدا وەرگرێت، لە یادەوەریدا پارێزگاری لێکراوە. رەنگە دەستەواژەی (نووسینەوەی قورئانی) بووبێتە مایەی پرسیارکردن.

چونکە قورئان بە سرووش دابەزیوە و بە سەرزارەکی راگەیەنراوە. نووسینەوەشی کاری مرۆییە، کە کەسێک راسپێردراوە و پێیهەلساوە. لەوەڵام دانەوەی ئەم پرسیارەشدا من باس لەدەقێکی قورئانی دەکەم وەکو ئەوەی نووسراوەتەوە، بەپشت بەستن بەبیسەری گوازەوەی لە پەیامبەرەوە کە راستەوخۆ ئەویش گوێبیستی بووە لە نێوەندکاری نێوان خۆی و خواوەند: جوبرائیلی فریشتە. وەکو ئەوەی هەموو گێڕانەوەکان لەسەری کۆکن.

-٢-

دەقی قورئانی وەڵامی پرسیارەکانی بوون و ئاکار و چارەنووس دەداتەوە. بەشێوەیەکی ئیستاتیکی- هونەری وەڵام دەداتەوە، لەبەرئەوە دەکرێت بەدەقێکی زمانەوانی وەسفبکرێت- مەبەستم پێویستە لەتێگەیشتنی زمانەکەیەوە لێیتێبگەیت. ئەم زمانەش بەتەنیا موفرەدات و پێکهاتەکان نییە، بەڵکو هەڵگری روانینێکی دیاری کراوە بۆ مرۆڤ و ژیان و گەردوونیش- کەبنەچە و نادیاری و کۆتایی هەیە.

ئەم فۆڕمە ئیستاتیکییە لە نووسیندا، عەرەبی سەرسام کرد، بەشێوەیەک کە کۆکن لەسەرئەوەی دەگمەنە و نموونەیان نەدیوە و هاوشێوەی نییە، بەم جۆرە بەپشت بەستن بەو پێودانگانەی کە دەیانناسی، نەیاندەزانی چۆن دیاری بکەن بۆیە گوتیان: پەخشانە،

بەڵام بەچەشنی پەخشان نییە، شیعرە و بەوێنەی شیعر نییە. کەوا بوو نووسینێکە زیاترە لەوەی لە شیعر و پەخشاندا قەتیسی بکەین. هەروەها گوتیان، نووسینێکە وەسفناکرێت، نهێنییەکە ناکرێت تیایدا ڕۆبچیت. پێکهاتن لەسەر ئەوەی کە هەڵوەشێنەرەوەیە بۆ سەرلەنوێ نووسینەوەی شیعر و سەروار و گوتار و پەیام، جۆرێکە لە بەنووبار لە پێکهاتەی تازەدا. خۆ ئەگەر ئەوەش زیاد بکرێت، کە دەقی قورئانی هەروەکو لەسەر زاری پەیامبەرەوە هاتووە بریتییە لە (کۆی ئاخاوتن) و جۆرێکە لە گەڕاندنەوەی لە پێشی سرووش، پشت بەستن بە قسەیەک لە سەحیحی ئەلبوخاریدا کە دەڵێت:" من و پەیامبەرەکان براین" بەواتای دایکیان فرەن و بەڵام ئایینیان یەکە، هەروەها بەپشت بەستن بەو گێڕانەوەیەیەی کە دەڵێت، وەرەقەی کوڕی نەوفلی ئامۆزای خەدیجەی هاوسەری، ئەوەی بۆ موحەممەد هاتووەتە خوارەوە بەوە وەسفیدەکات کە "ئەو نهێنگیرییەیە کە بۆ مووسا لەلایەن خواوە دابەزێنراوە". دەڵێم ئەگەر هەموو ئەمانەمان زیادکرد، توندی ناکاوگیری زمانەوانی و مەعریفیمان بۆ دەردەکەوێت، کە لەم دەقەدا نیشاندەدرێت بەلای عەرەبەوە، هەروەها چۆنیش کە ئەم دەقە خۆی نیشاندەدات هەموو گەردوونە لە کتێبدا یاخود هەروەکو ئەوەی خۆی وەسفدەکات، کتێبە.

بەڵام سەرسام بوونی یەکەمی عەرەب لەبەرامبەر قورئاندا، زمانەوانی بووە، کە بەئیستاتیکی و هونەری زمانەکەی شەیدابوون. ئەم زمانە کلیلی ڕاستەوخۆ بووە، کە دەرگاکانی کردووەتەوە بۆ چوونە نێو جیهانی دەقی قورئانی و باوەڕداری بەئایینی ئیسلام. لەبەر ئەوە لە هیچ ئاستێکدا، ناکرێت جیاکاری بکەین لەنێوان ئیسلام و زماندا.



دەشێت بگوترێت موسڵمانە سەرەتاییەکان کە کرۆکی تۆکمەی یەکەمی بانگەوازکردنیان بۆ ئیسلام پێکهێناوە، یەکەمجار باوەڕیان پێهێناوە بەو وەسفەی دەقێکی ڕوونە کە خاوەنیانە: باوەڕیان پێکرد، لەبەر ئەوە نا، نهێنییەکانی گەردوونی و مرۆڤی ئاشکرا کرد، یاخود سیستمێکی تازەی بۆ ژیان پێشکەش کردن، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەوان ئەوەیان تیادا بەدیکرد، کە نووسینێکە و سەردەمێکی واشیان نییە هاوشێوەی بێت.

بەزمان، قەوارەیان لەناوەوەڕا وەرچەرخا. بەزمان ژیانیان وەرچەرخا و تەماهیان لەگەڵ داکرد- بەزمان و دەربڕین ، ئەویش بووە بوونیان. هەروەکو ئەوەی لێرەدا زمان مرۆڤ بێت، نەک بەو وەسفەی ئامرازی پەیوەندی نێوان جیهان و ئەو بێت، بەڵکو بەو وەسفەی چییەتییەتی.

-٣-

وەسفکردنی دەقی قورئانی بۆخۆی بەوەی کە" قورئان سەرسورمانە" (١:٧٢) نەک هەر لەڕووی زمانەوە بەتەنیا، بگرە لەڕووی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی بوون و ئاکار و چارەنووسیش. وەسفکردنی خۆی بە "کتێب"- لەڕووی ئەوەی ڕەهای زمان و بوون و واتایە.

دەقی قورئانی لە سوورەت و سوورەتیش لە ئایات پێکهاتووە.

سوورەت بۆخۆی زمانەکە، فەرمایشتی خوایە و شکۆدار کراوە. هەروەها لە بونیادا جوان و درێژکراوەیە و لەبەرئەوەش بە سوورەتی دەقی قورئانی بە سوورەت ناودێرکراوە، چونکە دوابەدوای یەکدا دابەزیون و دابڕاوە لەوەی پێشەوەیەتی و ئەوەش کەبەدوایدا

دێت. واتە بۆ هەر سوورەتێک سەرەتا و کۆتاییەک هەیە و بەوەش لەوانیتر جیادەکرێتەوە.

هەرچی ئایەتیشە بۆیە بەم ناونراوە، چونکە ئاماژەیەکە بۆ راوەستان و چراندن یاخود لەبەر ئەوەی کۆمەڵە پیتێکە لە قورئان.

سوورەتیش لەڕووی بونیادەوە، برگە و پچرپچرە و زۆر جاریش سەرەوار و هەندی کاتیش پاش بەندداره، بەتایبەتیش لە سوورەتی ئەلمەکییەدا، سوورەتیش هەیە بەپێچەوانەوەیە، رێکخراو و بەردەوامە بە کێشی هەمەجۆر، بەپێی ئەو ریتمانەی کە لە سیستمی کێشدارییەوە دەردەچن. سوورەت، بەشێوەیەکی گشتی وەکو بەشێکی دیاریکراو لە فەزایەکی دیارینەکراو، والایە. بە چەشنی ئەستێرەیەکی مەلەوانکر لە ئاسماندا کە کتێبە. هەروەها دەشتوانین ئەستێرە لەهەمووڵایەکی بینراوەوە، لێی بڕوانین و لەهەر شوێنێکەوە کە بمانەوێت بیخوێنینەوە. درەوشاوە و تاوسەندووە پتر لەوەی دروستکارێک بێت کە لە دەورەوەرا، ئەندازە دەستی بەسەردا گرتبێت.

دەکرێت سوورەت بە کەڤاڵێک یاخود بەڕووویەکی بەرز لە پەیڤ بچوێنرێت، کە لە هێل و شێوە و رەنگەکاندا رێکوپێکە، ئەویش بە هەمەرەنگی و هەمەجۆری و بەیەکداچووندا. سپێتی لەنێوان ئایەتەکانیدا بەشێکە لەم بەرەیە، کە نیشانەی راوەستانی پۆشیوە، ناوبری نێوان ئایەت و ئایەتێکی ترە. بێدەنگیش لەخوێندنەوەیدا، دیسان بەشێکی تریەتی، چونکە بەو وەسفەی راوەستانە دەچێتە نێوان ئایەت و ئایەتێکی ترەوە. هەروەکو ئەوەی پەرژینی باخچە، کتێب بێت ، هەموو لایەکیشی دەرگابێت، باخچەیەک کە دەتوانین لە هەر شوێنێکەوە بمانەوێت بچینە ناویەوە، هەروەها لە لایەکیەوە. باخچەیەکی بێسنوور، کە بۆ خۆی سنووری هەمووشتەکانە، کتێبی



گەردوونیشە، بۆخۆی گەردوونە و لاپەڕەکانیشی پەرژینەکانیەتی. یاخود بێژین سوورەتەکان وەکو ئەستێرەن و هەمووشیان لەیەک خولگەدان کە: کتێبە.

زۆربەی سوورەتەکان، بۆتەی توانەوەی گوتار و پەند و سروود و دایالۆگ و چیرۆک و بانگکردنە، جیهانی ئامادەبوون و جیهانی نادیارییە، لەتۆرێکی بەردەوامی بی پنت و جیابوونەوە. (وەکو ئەوەی مالارمیە بەگاڵۆکەکان ناوی دەبات).

سوورەت لەڕووی ستراکچەری مۆسیکییەوە، بەتایبەتیش سوورەتی ئەلمەکییە نیزامێکی ریتمئامێزی تایبەتە، کە-کراپۆن ، کە دوکاپرۆنا- لەکتێبی گرنگی ( Le coram: auxsources de la parole oraculaire, paris1981)، دا شیکردووەتەوە لەوەدا پێشەنگ و بێ هاوتا بووە، وەکو من ئاگاداربم.

کراپۆن وایدەبینێ کە هەندێک لە سوورەتەکانی ئەلمەکییە ژمارە(٩٢،٩٣،٩٤) شێوە چوارینەییە(Quatrain) و هەندێکیشیان سروود ئامێز و هەندێکی دیکەشیان کێشی مۆسیکی بێ هاوتای تێدایە.

لە هەندێکیاندا دەنگی زۆری تیادایە کە باس لە پەیامبەر دەکەن، هەروەها کێشی جۆراوجۆر (سوورەتی٨١،٧٨،٧٦،٧٥،٧٤) هەروەکو ئەوەی دایالۆگی یاخود شانۆگەری بێت. لە هەندێکیشیاندا رستە هەیە، کە جگە لە رستە هاوسێ بوونیان پەیوەندییان بەیەکەوە نییە. ریتمی باڵادەستیش لە دوویەکەی کێشدار بەدەرنییە: فاعلن، متفاعلن. پێشی وایە کە هەندێکیان یەک کێش و هەندێکی تریشیان کێشی دوانەیە و بەشێکی تریش فرە کێشن.

(سوورەتی ٦٩) پێنج ڕەگەزی کێشداری لەخۆ گرتووە. لەکاتی شیکاریی مۆسیکیدا، ئاماژەی بەوە کرد کە هەندێک لە سوورەتەکان چیرۆک ئامێزییە، چیرۆکەکانی تەورات دووبارە دەکاتەوە. تەنانەت هەندێکیان بەشێوازی نووسینی دێرینی کەنعانی (سوورەتی ٧٢) کاریگەرە و بەکانتات (Cantate) دەیانچوێنێت. لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەین کە مۆسیکی شیعرە، هەروەکو عەرەب ناسیویەتی ناگاتە مۆسیکی ئەم سوورەتانە. بەم مۆسیکە وادیارە زمان چەشنی ترپەی دڵ و جووڵەی جەستەیە، بەم جۆری باوەشپیاکردنێکی زیندووە لەگەڵ جووڵەی گەردووندا.

بونیادی قووڵی ئەم مۆسیکە، هەر بەتەنیا لە هارمۆنی نێوان پیتە تاکەکانی گۆ و ئاوازەکانیدا نییە، بەڵکو بەتایبەتیش لەسروشتی پەیوەندی لەخۆدا تەواوی وشە و وشەدا یان لەبەندوباردا خۆی دەبینێتەوە. هەروەها ئەوە فیکریش نییە کە سەرنجمان بۆ ئەو مۆسیکە کێش دەکات، بەڵکە لەهەستکردن و چێژدایە کە بەرەو رووی دەچین.

بەم جۆرە بونیادی ناوخۆی قووڵی دەقی قورئانی لە مۆسیکی زماندا خۆی دەنوێنێ. دەقی قورئانی ئاوازە و دەکرێ لەبارەیەوە بەو وەسفەی میلۆدیسە بدوێین. ئاوازەکانیشی لەسەمتێکی دیاریکراودا یان لەسیستەمێکی کێشداری جێگیردا ناودێر ناکرێت، ئەمەش وایلێدەکات بزۆز و کراوە بێت.

-٤-

ئەو ناوە ئەدەبییە کامەیە، کە دەشێت سوورەتی پێناو بنێین؟ بەرلە بەرسڤدانەوە، ئەو پرسیارە سەرەکییە دەکەمەوە، کە ڕەخنەگرانی عەرەب کردوویانە لەهەمبەر دەقی قورئانیدا، کەئەویش ئەمەیە: جێگای



جیاوازی لەئاخاوتندا لەکوێدایە، واتە لەنووسیندا؟ یاخود ئەو تایبەتمەندییانە چییە کە نووسینی پێدەناسرێتەوە؟

وەڵامەکە بە بەرسڤی وردبینترین و بەئاگاترین ڕەخنەگری عەرەب-عەنیت ئەلجەرجانی- پوختدەکەمەوە. ئەو بڕیار لەوە دەدات کە دەقی قورئانی هەڵوەشێنەرەوەیە بۆ سەرلەنوێ نووسینەوەی عەرەبی بە شیعر و پەخشانەوە. هەروەها پاش ئەوەی بینی کە پێوەرە ناسراوەکانی هەڵسەنگاندن، لە هەڵسەنگاندنیدا بێ سوودە. پێشنیازی پێوەرێکی تری کرد کە بە بەندوبار - النظم- ناویبرد. پێناسەکردنی بەندوبار کارێکی گرانە- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دیاری دەکات، بەوەی کە دەڵێت: ڕێبازێکی تایبەتە لەریزکردنی وشەکان لەگەڵ یەکتریدا. واتە جۆرێکی تایبەتە لەدانان و ڕێکخستن لە هۆنینەوە و داڕشتندا.

بەندوبار لەدیباج دەچێت. کەوابوو تایبەتمەندی لەوەدانییە کە دیباجە، بەڵکو لەچۆنیەتی هاتووچوونی تاڵەکانی نێو ئەم دیباجە دایە- بەدرێژی و بەپانی چی دەڕوات و چۆن؟ بەچی دەستپێدەکات، بەچی دەبێتە دوانە و بەچیش دەبێتە سیانە و چۆن؟

ئەگەر بەندوبار لەهۆنینەوە و دانان و داڕشتن و ڕازاندنەوە و دامەزراندن و نەخشاندن بچێت، ئەوا پێویستە لەهەڵسەنگاندنیدا لە هارمۆنی بەشەکانی لەگەڵ یەکتریدا بڕوانرێت، تاوەکو هۆکارەکانی ئەوە بزانین کە بۆچی هەریەکەیان بەشێوەیەک دانراون و واش پێویستی کردووە، کە ئەگەر لەجێگایەکی تردا دابنرێت، دەبێتە شێواندنی هۆنینەوە یان هەموو دامەزراندنەکە.

بەم شێوەیە وشەکان بەوپێیەی واژەی تاکن لەڕووی چنین و پلەی لەیەکەوە نزیکی نێوان واتاکەی و واتای واژەی پێش و ئەو واژەیەی

لەدوایەوە دێت، لێک جیاناکرێنەوە. بەندوباریش لەسەر ئەم شێوەیەیە لـە دروسـتبوونی هـاوجووتی تۆکمـەی نێـوان گـۆ و واتـا. یـەکـەمـین تایبەمەندیشی سەربەواری واتایە، واتە واری روانین و ئەزموونگەرایی. یاخود بۆ گواستنەوەیە، بەدەربڕینی ئەلجرجانی.

جوداوازی لەبەندوباری ئاخاوتندا "ئەوەنییە کە گوێبیستی دەبین، بەڵکو ئەوەیە کە بەدڵ دەڕوانین و هانا بۆ فیکر دەبەین " (الاعجاز، ل٥١).

ئەم جوداوازییە بەشێوەیەکی تایبەت و لەسەر ئاستی دەربڕین، لە خوازەدا- خواستن و نوێنەرایەتی، لەکینایەشدا بەرجەستە دەبێت. خوازە و کینایە، دەرفەت بە واتا دەدەن لەوێنەی جۆربەجۆردا دەربکەوێت و وایلێبکات فرە رەهەند و جوانی بێت. بەم شێوەیە بەهای فۆرمەڵەبوونی ئەدەبی هەر لەواتایدا نییە بەڵکو لە گۆ " اللفظ "-دایە- کەبۆی هەڵگرتووە و بۆی ئاشکرا دەکات. بگرە کاتێک شیعر جوانی لەگۆ و بەندوباریدا لەدەستدەکات، شیاوی ناو هێنان نییە بە شیعر. (ل١٩٨). چۆن گۆ- اللفظ- بە پاراوی وەسفناکرێت لە پێناو زەنگ و زایەڵەیدا، بەڵکو لە پێناو جوداوازیدایە لەواتایدا. چونکە پاراوی لەبارەی گۆکانەوە ناگوترێت تەنیا بەو وەسفەی نەبێت کە بەندوبارە. بەکورتی ، تایبەتمەندی فۆرمەڵەبوونی ئەدەبی لە فۆرمیدایە(ل٢٠٥).

-٥-

ئەوناوە ئەدەبییە کامەیە، کەدەشێت سوورەتی پێناو بنێین؟ وەڵامیش، لەروانگەی ئەوەی کە دەڵێت تایبەتمەندی فۆرمەڵەبوونی ئەدەبی لە فۆرمیدایە، ئەوەیە کە ئێمە ناتوانین ناوی بنێین یاخود پێویستە لەسەرمان ناوێکی ئەدەبی تایبەتی بۆ دابهێنین. ئێمە ناتوانین



بێژین کە ئەوە پەخشانە، چونکە تایبەتمەندی دامەزراندن و دەربڕینی تێدایە و ئەوەش لە هەمووجۆرەکانی پەخشان جیادەکاتەوە، بەشێوەیەک کە ناوی هیچ جۆرێکیانی بەسەردا جێبەجی نابێت. هەروەها ناشتوانین بەشیعر ناویبەرین، لەبەر ئەوەی هیچ بەکارهێنانێکی بنەچەکانی تیادا نییە، تا بیکاتە شیعر، سەرباری ئەوەی چەندین جۆری دەربڕینی خوازەیی بەکارهاتوون، هەروەها چەندین فۆڕمی بەیان و رەوانبێژی. جگە لەوەش دامەزراندن لەهەندێک سوورەتدا و لە شێوگی دەربڕینگەراییدا، ئازادییەکی سەیر و هەمەکییە، کە بەمەش پۆلێنکردنی لەزانرەیەکی ئەدەبیدا گرانە و دیسان تێگەیشتنیشی هەر گرانە.

بە سەرەتاکانی هەندێک لەسوورەتی ئەلمەکییە بۆ نیشاندانی ئەوە، ئیکتیفا دەکەم. تیایدایە بەیەک پیت ێ،ق،ن، تیاشیدایە بەدوو پیت: حاءمیم، طاء سین، یاءسین، دەسپێدەکات. هەروەها تیایدا بەسی پیت: ئەلف لام میم، ئەلف لام راء، طاء سین میم، تیاشیدایە بە چوار پیت: ئەلف لام میم صاد، ئەلف لام میم راء، هەشیانە بە پێنج پیت، وەکو سوورەتی مەریەم: کاف هاء یاء عەین صاد دەستپێدەکات. سەرجەم سوورەتەکان بەدەستەواژەی: بسم الله الرحمن الرحیم، دەستپێدەکات جگە لە سوورەتی ئەلتەوبە نەبێت (ژمارە ٩).

هەموو ئەمەش مەرجێکی گران بەسەرئەوەدا دەسەپێنی کەبەرەنگاری راڤەکردنی دەقی قورئانی دەبێتەوە. مەرجی ئەوەی تیایدا بێت کە شارەزایی بەرزی لەزمانی- رێزمان و وشەسازی و داتاشین و زانستەکانی رەوانبێژی و خوێندنەوە و بنەچەکانی ئایین و فیلولۆژی و هۆکارەکانی دابەزین و - ناسخ و منسوخ-ی ئایەت و

وتەکانی پەیامبەر هەبێت. ئەمە جگە لە مەرجی ئارەزووی باڵا و باوەڕداری قووڵ. ئەم مەرجانەش لەهەموو کەسێکدا بوونیان نییە..

-٦-

کەوابوو ئەوەتانی خۆمان لەبەردەم دەقێکدا دەبینینەوە، ناوی لێنانرێت، یاخود پێوەرە جۆربەجۆرەکانی ئەدەبی ڕێگەی ناولێنانی نادەن. دەقێکە پێوەری لەدەرەوەڕا، لەڕێسا و پرانسیپە دیاریکراوەکان وەرناگرێت، بەڵکو پێوەرەکەی ناوخۆییە لەخۆیدا. کەواتە تەنیا ناوی هەر ئەوەیە لە خۆی ناوە: کتێب. واتە کتێب لێرەدا ناوی پەروەردگارە، یان ناوی زمان و کتێبە، واتای ئەمەش ڕەهاییە و مانای نازانرایێت، دەستپێناکات و کۆتایی نایەت. بەو وەسفەشی کە ڕەهایە لە کات و شوێندا دەردەکەوێت، دەلالەتی بزۆزە و کراوە و بێ کۆتاییە. بەکاتبووی هەمیشەییە، ئەو لە پشت ئەو مێژووەوەیە کە لێوەی دەڕوانین و لەمیانەی مێژووەوە دەیخوێنینەوە.

لەکتێبەکە و لەفۆرمی نووسینیدا، فیکر و شتەکان دەتوێنەوە، ژیان، ئاکار، واقیع و نادیاری. ئەم فۆرمەش بەیەکداچووی ڕایەڵەکانیەتی، کە لە پەیوەندی فرەییدا دەهۆنرێتەوە. کە هەمەجۆر و کراوەیە وەکو بۆشایی. جۆرێکی دییە لەهونەری وتن یان هونەرێکی ترە لە وتن. هونەرێکە لە نووسیندا، هونەرە لە چێبوونی دەقدا. هەروەکو ئەوەی جۆرێک بێت لە فیکری نووسین، کە جۆرێک لە نووسینی فیکر ناو پۆش دەکات، یاخود بڵێین: بەو پێیەی جۆرێکە لەنووسینی ڕەها، جۆرێکە لە ڕەهای نووسین. نووسینێکی ڕەهایە بۆ نووسینی ڕەها.

-٧-

ئەزموونی سۆفیگەرایی ئاسۆیەکیتر بۆ ئەم نووسینە واڵادەکات لە خوێندنەوە و لێتێگەیشتنیدا. کەئەمەش ڕەهەندی دەوڵەمەند و



هەمەجۆر بەدەقی قورئانی دەبەخشێت کە شایەنی هەڵوەستە کردنە لەلایدا، ئەگەر بەشێوەیەکی بەپەلەش بێت.

لەبەر ئەوەی سەرەکییە لە ڕوونکردنەوەی دەلالەتی قەوارەگەرایی زمان و نووسین پێکەوە.

دەقی قورئانی، هەروەکو ئەوەی ئەزموونی سۆفیگەرایی لێیدەڕوانێت، دالێکی زمانەوانییە بۆ مەدلوولێک کەبوونە. یەکەم ئاماژەیە و دووەمیش ئاماژە بۆ کراوە. کتێبەکەش بریتییە لە پەیڤەکانی خواوەند، کە هاوتای بوونە و، ئاماژەیە بۆ ڕاستییەکانی. هاوتای مرۆڤە و ئاماژە بۆ پەرژینێکە لە نێوان خواوەند و مرۆڤدا، لەنێوان ڕەهای ڕێژەییدا.

وشەی پەروەردگاری: "کُنْ" لەیەک کاتدا وتە و-کرداریشە. بوونیش جگە لە وشەکانی خواوەند نییە. بەم شێوەیە زمان، بوونیشە. هەروەها بوونیش زمانە. خودی کتێبەکەش بوونە، بەوپێیەی وتە- یاخود زمانەکە لە وشەی پەروەردگاری: "کَنْ" دا خۆی دەنوێنێت.

لەم ڕوانگەیەشەوە، زمانی مرۆڤ، گوتراو و نووسراوە، وەرکەوتەی زمانی پەروەردگارە، یاخود وێنەی ڕووی دەرەوەی زمانی شاراوەی پەروەردگارە. لەمەشدا ئاماژە بەمەترسی نووسین دەکرێت، کە مەسەلەیەکی قەوارەییە.

بە دەربڕینی ئەزموونی سۆفیگەرایی، ڕاستییە شیاوەکان بریتین لەپیتە شاردراوەکانی نێو مەرەکەب، ئەو پەڕانەش کەتیایدا دەنووسرێت بەرفراوانبوونی ڕووناهی بوونی گشتییە، کەتیایدا وێنەی هەبووەکان دەستنیشان دەکرێت. نووسینیش نهێنی دەرخستن و دۆزینەوەیە، پێنووسیش هۆ و ئامێرە، نووسەریش بەواتای ڕەسەنی هەق، خواوەندە، بەوپێیەی هەبوو و خوڵقێنەر و وێناگرە، خاوەنی

زانستی یەکەمینە، خاوەنی تێڕوانینی شیاوەکانە، هەروەها مرۆڤی تەواوە، بەو وەسفەی دەرکەوتەی ئەوە. بەم شێوەیە زمانی نووسین رووکەش و ناوەخنی هەیە. ئاماژەسازی لە رووکەشی زمانی پۆزەتیڤیزمدا ناسراو و رێککەوتنە. بەڵام ئاماژەسازی لە ناوەخندا خودگەراییە کە دژایەتی لە نێوانیاندا هەیە و مرۆڤی تەواو لایدەبات، کە ئەویش پەرژینی کۆکەرەوەی نێوان رووکەش (زمانی مرۆڤیی ) و ناوەخن ( زمانی پەروەردگار)ە. مرۆڤ ناتوانێت لەم زمانە بگات، بەو وەسفەی شاردراوەیە. خۆ ئەگەر ئەوە تێنەپەڕێنی بەو وەسفەی رووکەشە، ئەوا ناشتوانێت ئەم تێپەڕاندنە فەراهەم بکات. ئەگەر لەخودی خۆیدا حاڵەتی باڵا لە شەفافیەت کە دەیگەیەنێتە رەها یان نادیاری مسۆگەر نەکات بەجۆرێکە کە بۆ دەروونی خواوەندێتی دەگۆڕێت. ئەودەم  دەزانێت بەو وەسفەی کە تاکە، ئەوەنییە. ئەو بیرکەرەوە و نووسەر نییە، تەنیا بەو وەسفە نەبێت کە "بیرلێکراوە" و "نووسراوە".

لەم ئاسۆی سۆفیگەراییەشدا، دەکرێت بگوترێت کە نووسین بەو وەسفەی رەهایە، دەستپێناکات و کۆتایی نایەت. هەروەکو پێشتر ئاماژەی پێکرا، ئەوەی لەم ئاسۆیەدایە، خودا خۆیەتی: هەموو دەرکەوتن و هەموو شاردراوەییە لەیەک کاتدا. دەبینی و نابینی، وەسفدەکرێت و وەسفناکرێت لەیەک کاتدا. تێدەگات و لەبەردەوام بووندایە لەیەک کاتدا.

هەموو نووسینێکیش لەدەرەوەیدا جگە لە وتنی مەحاڵ هیچ ناڵێت. بەم شێوەیە کتێب زمانێکە بە بەردەوامی خولقاندنی زمان دووبارە دەکات و هەر بە تەنیا زناک(علامە) و ئامرازەکان نییە. زمان لێرەدا ساتێکە، کە ئەبجەدیەتە. لەهەمان کاتدا گەردوون و خواوەنداریێتییە،



نهێنی و نادیارەکانە، شتێکە و میتای هەیە، ناکۆتاییە: بنەچە و دوا رۆژە.

لێرەدا کتێب بەو وەسفەی نووسراوە، زەروورەتە. بەڵام بەو وەسفەی خوێندنەوەیە، رێکەوتە. با بە دەربڕینێکیتر بێژین، بە وەسفی یەکەمی ئیحکامە و بە وەسفی دووەمیشی پەیامی خوداییە. لەم ئاسۆیەدا نووسین نابێتە نووسینی ژیان، ئەگەر نووسینی مردن نەبێت.

نووسینی بوونەوەرە لەپێناو مەرگدا. نووسینی تەوەرگیرییە لەدەوری رەگ نەک لەدەوری بەروبووم و، بەسەر پردی کارەسات- ژیان، پردی لابردن دا تێدەپەڕێت.

نۆرماڵیشە کە کتێب لەم ئاسۆیەدا، خودگەرایی نییە و چارەسەری تان و پۆی شتەکان دەکات نەک بەشەکانی. لەگەڵ گەردوون نەک لەگەڵ خوددا بەڵام لە میانەیەوە تێکدەئاڵێت. هەروەکو ئەوەی لەمیتای سروشتەوە، سروشتێکی تایبەت هەیە و ئاشکرای دەکات، کە ئەو سروشتە تایبەتەش بریتییە لەکتێب.

ئایا لەم ئاسۆیەدا بڵێین، کە نووسەر ئەو بوونەوەرە خەیاڵکەرەوەیە لە یەکێتی خواوەندێتی- مرۆیی، بەزمان و ئەوی تیایدایە؟ ئایا ئەو تیشکۆیەیە کە لەنێوان پەیامنێر و پەیامبەردا، هەروەها پەیامبەر؟ لەنێوان مێژوودایە؟ ئایا نووسەر، نانووسەرییە؟ ئایا نائامادەبوونی، ئامادەبوونیەتی؟ ئاخۆ نووسینی نموونەیی بەبێ نووسەر دێتە ئاراوە؟

دەرەنجام دەگەینە ئەم پوختەیەی لای خوارەوە:

یەکەم، دەقی قورئانی کەس-الشخصی- تێدەپەڕێنی: خواوەند رەوانەی کردووە و فریشتە بۆ پەیامبەری گواستووەتەوە،

پەیامبەریش بەخەڵکی ڕاگەیاندووە و، نووسەرانی پەیامیش نووسیویانەتەوە.

ئەمە کارێکی خودایی- مرۆییە، کارێکی گەردوونییە. هەروەها بەو وەسفەی ئەتمۆسفێکی بی کۆتاییە بۆ کۆی خەیالبەرەوە. ڕەنگە ئەوەی کە ئالۆزە تیایدا بەو وەسفەی کە کتێبە و پێچەوانەی ئەودەبێت کە ڕووکەشی بێت، ئەوەیە کە بەدواداچوونی ئەوەی بەر خۆی و تەواوکەریەتی: کۆتایی پێهێنانی پەیامبەرێتییەکانە. بەواتایەک نووسینی، کۆتایی پێهێنا.

بە کاریگەری ئەوەی کە شتێک دەیهێنێتە ئاراوە نەنووسراوەتەوە، وەکو دەربڕینەکەی مالارمییە، بەڵکو خودی شتی نووسیوەتەوە.

لەبەر ئەوە دەقی قورئانی مەسەلەی شیعر یاخود پەخشان چییە، پێشنیاز ناکات. بەڵکو پرسیاری: نووسین، کتێب چییە، دەکات؟

بەم جۆرە دەقی قورئانی بەو وەسفە دەخوێنرێتەوە کە لە بونیادیدا سەرجەم فۆڕمەکانی نووسین هەیە. هەروەکو ئەوەی ئەبجەدییەتی بۆ بەر لە نووسین گەڕاندبێتەوە و لەمیتای جۆرەکانی نووسیندا هەبێت. وەکو بگوترێت، کە ئەم جۆرانە لەنێوان دوو کەوانەدا دانرابن یاخود هەڵیوەشاندبێتەوە بۆ ئەوەی جۆرێکی تر بخولقێنێ.

دووەم، ئایین و زمان لەم دەقەدا فۆڕمی یەک گیانن، یاخود بونیادی ڕۆحێکن. لەبەر ئەوە لە پەنهانی کە مرۆڤ ناتوانێت پەی پێبەرێت، چێدەبێت. وەکو ئاشکراشە ئەوەی ڕاستەوخۆ لە ڕووکەشی گۆ دەزانرێت، بریتییە لە ئاسۆیەکی کراوە، بەڵام بەڕووی نادیاردا.

سێیەم، ڕەهەندی قووڵ لەم دەقەدا، ڕەهەندێکی تراژیدییە، چونکە نا ئامادەیی و لابردن لە ناوچوون ئاشکرا دەکات. هەروەها زەمینیش پردێکە بەرەو نادیاری. نیشتەجێبوونیش لەسەری، نیشتەجێبوونە بۆ



ئەوەی کۆچدەکات، نەک ئەوەی ئۆقرە دەگرێت. ئەوەی قورسییەکی گەردوونی بەم ڕەهەندە دەبەخشی گەڕاندنەوەی دەقی تەوراتییە، وەکو ئەوەی بۆ مووسا دابەزێنرا، لە ئیسلامدا بەناویەوە بە عەرەبی گەڕێنرایەوە. بەڵام بۆ گەلێکی تایبەت نا، بەڵکو بەبی جوداوازی بۆ سەرجەم مرۆڤ. دەقێکە لەناویدا هەموو دەقە ئایینییەکان دەتوێتەوە و خواستی ئەوەی هەیە، کە لەهەموو مرۆڤ یەک نەتەوە بخولقێنی.

ئاخۆ لەبەر ئەوەیە سەرجەم فۆڕمەکانی گوزارشتکردن لەیەک فۆڕمی تەعبیریدا دەتوێتەوە و ئەو نوێنەرایەتییان دەکات؟

ئاخۆ بەو وەسفەی گەڕاندنەوەیە، نووسینێکە و دەبێژێت، کە سەرجەم نووسینەوەکان بریتین لە دووبارە بوونەوەی، بەڵام لە سیاقێکیتردا؟

چوارەم، لەگەڵ دەقی قورئانیدا، لەڕووی مرۆییەوە، مرۆیەکی تازە دامەزرا. لەڕووی ئەدەبی نایابیشەوە لەگەڵیدا، خوێنەرێکی تازە و ڕەخنەیەک و ئارەزوویەکی تازە دامەزرا.

ئەوەتا لەڕووی ئەدەبی نایابەوە، شێوازێکە بۆ گوزارشتکردن کە جیاوازییە ترادسیۆنییەکانی نێوان فەلسەفە و ئەدەب، نێوان زانست و سیاسەت، نێوان مۆراڵ و جوانی هەڵدەوەشێنێتەوە. شێوازێکە جۆرەکان تیغدەکات لەڕووی فۆرم و لەڕووی میتۆدیشەوە لەیەکەوە نزیکییە مەعریفییە ترادسیۆنییەکان تیغدەکات.

لەم وێرانکردنەی جیاوازییەکانی نێوان زانراوە ئەدەبییەکان، تایبەتمەندێتییەک ئاسۆیەکیتر بۆ نووسین والادەکات و تواناکانی دی بۆ دەستەبەر دەکات. نموونەیەکە لە نووسین، کە جۆرە جیاجیاکانی مەعریفە-فەلسەفە و مۆراڵ، سیاسەت و یاسادانان، سۆسیۆلۆجیا و ئابووری بەشداری تیادا دەکەن. هەروەها جۆرە جیاجیاکانی نووسینی

ئەدەبی گێڕانەوە و دیالۆگ، چیرۆک و مێژوو، دانایی و ئەدەب بەشداری تیادا دەکەن. لەیەک کاتدا فەلسەفی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و مێژوویيە، کۆکەرەوەی نێوان سروشت و متیای سروشتە. لەمەشدا زەمینە بۆ نووسەر دەسازێنی کە چاو بە روانینی خۆی بۆ مرۆڤ و جیهان و نووسین بخشێنێتەوە.

ئەم تێڕوانینەش جگە لە گەردوونی و مرۆیی و رووگەیەکی زیاتر بەرەو مرۆڤ بەو وەسفەی مرۆڤە چیترنییە. ئەوەی لەپشت نەژاد و رەنگەوەیە، لەپشت هەموو ئینتیمایەکیشەوەیە نابێتە هۆی جیاوازی نێوان مرۆڤێک و مرۆڤێکیتر جگە لە قووڵی دەربڕین و دەوڵەمەندێتی تاکگەرایەتی بۆ ئەم تێڕوانینە چیترنییە.

دەقێکە- بانگهێشت کردنە بۆ نووسینی بەدیدێکی نوێ، کە دەکرێت بە خوازە بە ئاراستەیەکی تردا ناوی بێنم، بەهەردوو ئەو واتایەی کە ئەم وشەیە لەخۆیگرتووە: پەڕینەوە بۆ مرۆڤ و گوزارشت کردن لەم پەڕینەوەیە بە چاکترین شێوە.

پێنجەم، ئەم دەقە کلیلە بۆ تێگەیشتن لە جیهانی عەرەبی. کەسیش لە موسڵمان و مێژوویان تێناگات، ئەگەر ئەم تێگەیشتنە بخوازێت، جگە لەوەی کە سەرەتا ئەم دەقە دەخوازێت، هەروەها گەمارۆدانی ئاستی پەیوەندی لەخۆدا بووی نێوان ئەو و موسڵمان، کەبێ ئەوە موسڵمان نامۆیە و لەوی دی دابڕاوە. ناشزانم کە چۆن نووسین دەبێتە مرۆیی و گەردوونی، مادامەکی لەوی دی تێناگات. یاخود نایەوێت یان هەوڵنادات تێبگات؟ دەبێ بەهای نووسینی داخراو و گۆشەگیر لەویتر چی بێت؟ لەم چاخە گەردوونییەدا، بەتایبەت مرۆڤ خودی خۆی نییە، هێندەی دەبێتە ئەویتر.



بۆ ئەوەی مرۆڤ لە وڵاتەکەی خۆیدا هاووڵاتییەکی زیندوو و راستەقینە بێت، دەبێت هاووڵاتییەکی گەردوونی بێت.

شەشەم، نازانم چ پەیوەندییەک لەنێوان کتێب، وەکو ئەوەی من لەبارەیەوە دەدوێم و، ئەو کتێبەشی کە مالارمیە لێیدەڕوانێت. بەڵام هەموومان دەزانین کە بەرلەوەی مالارمیە پرۆژەی نووسینی بەناوی کتێب ناوبنێت و ویستی بیکاتە " بناغەی جیهان و پوختەکەی" بەرلەو وادەیە بەنزیکەیی چواردە سەدە، لەزمانی عەرەبیدا نووسینێک هەبووە بەناوی کتێب، کە بناغەیە بۆ جیهان و پوختەکەی و کۆتایی ئاخاوتنیشە. نووسینگەلێک هەن کە تاقیکراونەتەوە و هێشتا بەرەو نادیاری هەڵمانگرتوون. ئەی بۆچی بەردەوامین لە هەڵگرتنی؟ ئاخۆ ئێمە دیلی تەقلیدی خنکێنەرین لەجۆرێکیتر؟ ئایا ئەرکی یەکەمی نووسەر لەم پرسیارەیدا نییە: کە چیان لەوە وەرگرتووە کە پێشم کەوتوون؟ ئاخۆ ئەم چاخانەی کە دێن، پێویستیان بە جۆرێکیتر لە نووسین نییە؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە، کە دەمەوێت ببێتە کۆتایی بۆ ئەم توێژینەوەیە.

## پاشکۆ: پرسینەکان ـ تێڕامانەکان

-١-

ئەگەر دەق بەواتایەک، خوێندنەوەیەتی، واتە چۆنیەتی خوێندنەوەی و ئاستیشی سەر بەئاستی ئەو خوێندنەوەیەیە لەوردبینی و تێگەیشتن و دەوڵەمەندی، ئەوا دەق فرە ئاستە. خوێندنەوەکانی جۆراوجۆرە. لەم روانگەیەشەوە دەشێت ئەم پرسیارە بکەین: ئاستی خوێندنەوەی باوی تێکستی قورئانی چۆنە؟ پێموایە بەرسڤ بەم جۆرەیە: لەم خوێندنەوەیەدا ئەوەی ئاسۆی ئەپستمی ئیسلامی دەشێوێنی و ئەوەش کە تێڕوانین بۆ جیهان و مرۆڤ و شتەکان بەرتەسک دەکاتەوە، بەواتایەکی دی خوێندنەوەیەکە ئەم دەقە ناکاتە ئاسۆیەک هێندەی دەیکاتە تونێلێک. هۆکارەکانیش بۆ زۆرشت دەگەڕێتەوە، لەوانەش بەتایبەتی، باڵادەستی روانگەی شەرعی. بەجۆرێک کە شەریعەت تەنیا بناغەی فیکر و کار و گەردوون و شتەکانە.

لەم خوێندنەوەیەدا بەزەرووڕەت روانگەی ئایدیۆلۆژیای- سیاسی باڵادەست بووە. بەم شێوەیە موسڵمان بەپێی ئەم خوێندنەوە شەرعییە- سیاسییە؛ لە نێوان شەرعی و سیاسیدا بە ئابلۆقەدراوی خۆی دەدۆزێتەوە: نەمانی ئازادییەکەی و لەناوەوەشدا کەینونەی دەکوژێتەوە و واهەستدەکات کە ئامێرە و دەستی شەرع دەیجوڵێنی، مەبەستم لەدەستی سیاسەتە.

ئایا لەمڕۆدا ئیسلام باونییە، هەروەکو ئەوەی لە خوێندنەوەکانیدا باوە، کە تەنها شەرع و سیستمی سیاسییە؟ ئەو نووسینەش کامەیە کە هەوڵی سەپاندنی دەدات؟ جگە لە فۆڕمێکی خوێندن کە بەشێوەک



لە شێوەکان لە دەقی قورئانییەوە بەو وەسفەی شەرع و سیاسەتە سەرچاوەی گرتووە، چیترنییە.

ئەوەی لێرەشدا بە نووسەر ناوی دەبەین، هەر بەتەنها نووسەر نییە، بەڵکو یاسادانەریشە، بەو وەسفەی یاسادانەر و سیاسیشە. بەم جۆرەش دەکرێت بگوترێت کە نووسین لەم خوێندنەوە باوەدا بۆ ئیسلام نابێتە هونەر ئەگەر لەبەرایدا ئاکار نەبێت، بە واتای ئەو بڕیارەی کە ئەم خوێندنەوەیە دەیدات. واتە ئیمانداریتی- ئاماژەی یەکەمی پابەندبوون بە شەرع و ملدان بۆی.

خوێندنەوەی باو بۆ ئیسلام، دیسان ئەوبیرۆکە باوەی ناو تەورات دووبارە دەکاتەوە کە " خواوەند یاسادانەر، پادشا و پارێزەری شەریعەتە" لەسەرزەوی و بەپێی ئەم (شوناس)ەش کە خواوەند خۆی پی وەسفدەکات یاخود مرۆڤ بۆی زیاد دەکات، بەڕیوەدەچێت. ئەو پرسیارەش کە پێویستە لەم چوارچێوەیەدا بکرێت ئەوەیە: مرۆڤ چیدەکات؛ کە دەبینی خودا بەپلەی یەکەم نە یاسادانەر و نە پارێزەری شەریعەت و نە پادشاشە- بەڵکو بەپلەی یەکەم جوان و بەخشندە و خۆشەویستە؟ ئەم مرۆڤە چۆن دەنووسێت و، چیش دەنووسێت لەجیهانێکدا کە شەرع حوکمی دەکات و سیاسەت بەڕێوەی دەبات؟

هەروەها ئەوەش زیاد دەکەین، کەدەقی قورئانی لەسەر ئاستی جەماوەرێکی بەرفراوان ناخوێندرێتەوە، تەنیا بەبیستن نەبێت: گواستنەوەیەکی ئیمانداری یاخود سترانێکی لاوەنونەوەیی. ئایا لە هەموو ئەمەدا رێگە بەوە نادات کە بڵێین قورئان، ئەم دەقە پیرۆزە، بەم خۆ پیرۆزکردنەی پەردە پۆش کراوە.

-٢-

ئەلجەرجانی وایدەبینێ، کە نووسینی قورئانی تایبەتمەندی خۆی هەیە و بەرلە دابەزینی قورئانیش نەزانراوە. هەروەها خۆی نە لە وشە تاکەکان- لە جوانی پیت و دەنگ و زایەڵەیدا و نە لە پێکهاتەی بزۆزی نەبزۆزییەکان و نە لە برگە و ناوبڕەکاندا نابینێتەوە. بەڵکو ئەم تایبەتمەندییانە لە بەندوبار و دانان- التألیف- دا خۆی دەبینێتەوە، کە هەردووکیان پێویستیان بە خواستن و کینایە و تەواوی جۆرەکانی خوازە هەیە.

لێرەوە بەندوبار و دانان و دەدات و بەوەش پێکدێن. (الاعجاز ص٣٠٠)

جگە لە نیگا کردن و فیکر و بیر لێکردنەوە، ڕێگایەکی تر بۆ زانینی ئەم تایبەتمەندییانە نییە. بەتایبەتیش هەروەکو ئەلجەرجانی بە دوایدا دەچێت. ئەو پەندانەی ئاخاوتن کە نووسەر دایدەچنێت وەکو ئەوە وایە کەسێک پارچە زێرێک یاخود زیوێک لە یەکتریدا بتوێنێتەوە تا دەبێتە یەک پارچە... وەکو ئەڵقەیەکی بۆش کە دابەشکردن پەسند ناکات. ئەوەی لە وشە دروستدەبێت هەروەکو ئەوەیە زێڕەنگەر پارچە زێرێک دەتوێنێتەوە و پاشان لە قاڵبدا دایدەڕێژێت و بازنگ و پاوانەت بۆ دەردەکات. خۆ ئەگەر تۆ هەوڵبدەیت گوتراوەکانی کۆپلەیەک بپچڕێن لە یەکتری وەکو ئەوە وایە کەسێک ئەڵقەکە بشکێنێ و بازنگەکە درز تێبکات: (لێرەدا ئەلجەرجانی ئاماژە بە کۆپلەی بەشار کوڕی برد، دەکات((کأن مثار النقع فوق رؤوسنا/ واسیافنا، لیل تهاوی کواکبە)) هەروەکو ئەوەی تەڕایی لەسەر سەر و/ شمشێرەکانماندا بکا و، شەویش ئەستێرەکانی بەرببنەوە). ئەم کۆپلەیە لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی یەک ئاخاوتنەکە لە واتاکانی دەدوێم و گوتراوەکانیش لەو پێناوەدایە. (الاعجاز ص ٣١٦-٣١٧).



لەسەر ئەو بناغەیەی کە ئەلجەرجانی دبێژیت، بۆم دەلوێت کە دووربکەومەوە و ئاماژە بە لێکچوونێکی سەرنج ڕاکێش بکەم، لە نێوان ئەوەی کە نووسینی قورئانی لەوەی کەدەیڵێت دەیسەپێنی و ئەوەش کە مالارمیە لە مەڕ نووسین دەیڵێت. ئەم لێکچوونەش ئەوە دەگەیەنێت کە مالارمیە وایدەبینی بەو وەسفەی نووسەرە، خودێکی رەهایە و نووسینێکی رەها دەنووسێ، کە خۆی لە کتێبدا دەبینێتەوە. هەروەکو ئەوی بۆ خۆی دروستکاریێ بێت و نووسینی رەها و تایبەت بە جیهانی رەها و تایبەتی خۆی چێبکات. من ناخوازم بچمە نێو شیکاریکردنی ئەم لێکچوونە، ئەوەش کە مالارمیە لە بارەی نووسین و ئاخودگەرایی نووسینی و دەیڵێت، ئەوە شتێکیترە. وەلێ لە نێوان دوو نووسینەکەدا جیاوازییەکی جەوهەری هەیە: زمان لە نووسینی قورئانیدا وەسفناکرێت: هیچ شتێک و هیچ شوێنکارێک کە (مالارمیە) لێی دەدوێت، ئەمەش دوا وتنە و کۆتایی وتنیشە. مرۆڤیش بۆ خۆی ئەم شتانە دەزانێت، نەک بەگەڕانەوە بۆ ئەو بەڵکو بەگەڕانەوە بۆ خودی ئەم وتەیە، کە بە تەنیا پێناسە دەکرێت. هەروەها لە ناو ئەم وتەیەشدا نەبێت (هەبوون)ی نییە.

-٣-

قسەکەر لە دەقی قورئانیدا، بەو وەسفەی سرووشێکی دابەزیوە، بریتییە لە خواوەند. بەو وەسفەش دەقێکی نووسراو و-خوێندراوەیە، بریتییە لەئاخاوتنی خودایی- واتە زمان. ئێمەش بۆ ئەوەی لەدەق تێبگەین، داوا لە زمانی دەکەین هەڤپەیڤینی لەگەڵ بکەین و بیدوێنین- بەم واتەیەش لەگەڵمان دەدوێت. خواوەند سرووشی ڕەوانەکرد و نەینووسیوە. ئەوە مرۆڤ بوو کە دەنووسێ. بەڵام لەو دەمەی سرووش چووە نێو ڕۆژگار و مێژووەوە، لەو کاتەوەی سرووش لە زماندا بوونی هەبوو، هەروەها لەوکاتەوەی بۆ دەقێکی نووسراو

گۆڕدرا، بەو وەسفەی نووسراوە، بوو بە قسەکەر، واتە بووە زمانێک کە خۆی قسەکەرە.

لێرەوەیە گرنگی پوختەیی، کە بێخەوشییەکی بالآی تێدایە، بۆ ئەوەی بتوانین گوێی بۆ رادێرین و لەگەڵیدا بپەیڤین و لێتێبگەین.

هەر لێرەشەوەیە هەمیشەیی دووپاتدەبێتەوە و ناگۆڕێت- ئەویش لەبەر ئەوەی قەوارەگەرایی پێغەمبەرایەتی و زمانی سرووشە.

-٤-

لەڕووی نووسینیشەوە، دەقی قورئانی پێمان دبێژیت: کە هونەری جۆری پەخشان و ئەو جۆرەی بەشیعر ناودەبرێت نییە. پێمان دەڵێت: پەیڤەکان، بەندوباریان هەیە و بەمەش ئیرادەی هونەر دەبێت و کاری نووسینەوەش هونەرییە. کێش و بە ئابلوقەدانی واتا، دەروازە نییە لەوەدا، بەڵکو نووسینێکی پتر ریشەیی و پتر گشتگیرترە لەوەی لەکێشدا قەتیس بێت. کێش رەگەزێکە لە دەرەوە و نایەتە ژوورەوە. بەو وەسفەی کە کێشە لە دروستکراوی شیعریدا، نووسین لەدایکدەبێت. لەدایکبوونی خۆشیدا رێساکانی لەدایکدەبێت.

-٥-

فۆڕمی گوزارشتکردن لە دەقی قورئانیدا، فاکتەرێکی یەکلایی کەرەوە بووە لە بەدەنگەوە چوونی ناوەڕۆکە فێرکارییەکەیدا. هەروەکو ئەوەی زمان دەرگاکانی بۆ ئایینی نوێ، کە ئیسلامە والآکردبێت.

لە سەربوردەیەکدا عومەری خەلیفەی دووەم لەڕێگای بیستنەوە باوەڕی بە ئیسلام هێناوە، دەڵێت: کاتێ گوێبیستی قورئان بووم، دڵم بۆی نەرم بوو. گریام و بووم بە ئیسلام.

لە سەربوردەیەکدا شتێکی لە سوورەتی تەها خوێندووەتەوە، کە لە کاتێکدا بووە سەرکۆنەی ئەوانەی کردووە کە بوون بە ئیسلام.



دەڵێت:" ئەم ئاخاوتنە چەندە چاک و بەخشندەیە" ئیتر بە ئیسلام بوونی جاڕداوە.

ئەلوەلید کوڕی ئەلمغەیرەش کە یەکێک بووە لە پیاوە گەورەکانی قورەیش، کاتێک گوێی لەهەندێک بووە بە قورەیشییەکانی گوتووە" بەخودا، هیچ پیاوێک لە ئێوە نە بەشیعر و نە بە قەسیدە و نە بە بەیت پەرستی و نە بە شیعرەکانی جنۆکە لەمن زیاتر نازانێت. بەخودا ئەوەی دەوترێت هیچی لەمە ناکات. وتنی ئەمە شیرینی تێدایە، لەرووشیدا بۆن و بەرام هەیە و ئەوەش تێکدەشکێنی کە لە ژێرەوەیدایە، لەوە بالآتر دەبێت کە بالآیە".

هەروەها دەڵێت:" ئەمە دەبێت ئەفسوونێکی کاریگەر بێت، کە بینیتان چۆن ناکۆکی دەخاتە نێوان پیاو و کەسوکار و هەوادارانییەوە".

( بیوگرافیای ئیبن هشام). بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا خۆی بە گەورەزانی و بە ئیسلام نەبوو.

ئەمە لێرەدا ئاماژە بەوپەڕی کارابوونی دەق دەدات بە نێگەتیڤ و پۆزەتیڤ بوونی. هەروەها پێویستی بە لێکۆلینەوە هەیە، بە تایبەتیش ئەوەی پەیوەستە بە پەیوەندی نێوان ئیستاتیکا و زانستی دەروونناسی. کاریگەری دەق کارایی لە- نزیکخستنەوە یاخود دوورخستنەوەدا هەیە. ئەمەش جیاکەرەوەی یەکەمی هەموو دەقێکی مەزنە. ئەم سەرسام بوونەی بەردەم دەقی قورئانی وایکردووە، کە هەندێکیان بڵێن:" من لەبارەی قورئانەوە هیچ ناڵێم" سعیدبن المسیب.

-٦-

لەسەر ئاستی رووئیادا، سرووشی دەقی قورئانی بە "الکتاب"، "الفرقان"، "النور"، "الهدى"، "الرحمە"، "الشفاء"، "المبین"، "الموعظە"، "البشیر"، "النذیر"، وەسفکراوە. لە ئاستی دەربڕینیشدا بەمجۆرە

وەسفی دەکات:" ئێوە قسەی جۆراوجۆر هەڵدەبەستن" (الذاريات)، گوایە" قورئان سەیرە". "کەسێک گوێی لە جنوکەکان بووە، کە وتوویانە گوایە گوێبیستی قورئانێکی سەیربوون" (الجن).

قورئان بەبی هۆ دانەبەزیوە تەنیا بۆ یەک جار نەبێت: کاتی پەیامبەر بەرەو ئاسمان چەماوەتەوە، خواوەندیش راستەوخۆ سرووشی ئاراستە کردووە. واتای ئەمەش ئەوەیە کە بەقسەکردن، قسەی لەگەڵ کردووە. هەروەکو ئەوەی کە پێشتر لەگەڵ موسادا هەیبووە.

لە فەرموودەشدا، پەیامبەر جوبرائیلی فریشتەی بینیوە، کاتێک بۆ لای هاتووە" لەسەر کورسییەک لەنێوان ئاسمان و زەمین دانیشتووە". لەهەواڵەکانیشدا، جوبرائیل لە فۆرمەکانیتردا سرووشی بۆ هێناوە. لە وێنەی پیاوێکی ئەعرابیدا، کە لە نێوان هاوەڵەکانیدا دانیشتووە، دەیبینن و گوێیان لەقسەی دەبێت، بێئەوەی کە بزانن ئەوە جوبرائیلە. هەروەها لەدەنگی شێوەی لێدانی زەنگدا بۆلای دێت و سرووش لە ئەندێشەیدا دەڵێتەوە. لەشێوەی پادشایەکی باڵداریشدا بۆلای دێت.

کۆ دەنگییەکی ئایینیش هەیە، کە پەیامبەر نەخوێنەوار بووە و، ناخوێنێتەوە و ناشنووسێت. سرووشیش کە بۆی هاتووە، بەو وەسفەی هەقیقەتێکە لە خۆیدا و بەخودی خۆی پێشوازی لێکردووە، بەسەربەخۆییەکی تەواو لە فیکر یان هەستیدا: تەنیا وەکو گوازەرەوەیەکی دەستپاک بووە.

هەروەها کۆ دەنگی لەسەر ئەوەش هەیە کە ئایەتەکانی یەکەمین لە سوورەتی ( العلق) یەکەمینیانە کە بۆ پەیامبەر دابەزیوە: " أقرأ، باسم ربک الذی خلق ، خلق الانسان من علق، أقرأ وربک الاکرم الذی علم بالقلم، علم الإنسان مالم یعلم". ئەوکاتەش تەمەنی چل ساڵان بووە. لە مانگی ئابی ساڵی ٦١٠ی زایینیدا.



بەڵام دوا ئایەتەکانیش کە دابەزیون، بۆ ناکۆکی گۆڕیویی. (بڕوانە تفصیل الخلاق فی کتاب الاتقان فی علوم القرأن للسیوطی:١٦/١-٣٨).

لێرەدا پێویستە دوو پرسیاری سەرەکی بکرێت:

أ-چۆن ئایەتەکان کە بە درێژایی بیست و سی ساڵ دابەزیون (دەساڵ لەمەککە، دەساڵیش لە مەدینە) رێکخراون، چۆن لەسوورەتەکاندا رێکخراون و گەیشتووەتە سەد و چواردە؟ ئەو وەڵامەش کە بۆچوونەکان لەسەری کۆکن بەتایبەتیش لەسەر مەسەلەی رێکخستن، ئەوەیە کە دانراون، واتە پەیامبەر دەستی لەوەدا نەبووە. هەروەها بەنیسبەت هاوەڵەکانیشی. ئەو لەرێگای جوبرائیلەوە ریزبەندی ئایەتەکانی وەکو سرووش وەرگرتووە.

ب- پرسیاری دووەم ئەوەیە کە چۆن ئەم ئایاتانە لە قورئان یاخود لە مەسحەفدا کۆکراونەتەوە؟ وەڵامیش کە هەموو بۆچوونەکان لەسەری تەبان ئەوەیە، لەدوو سەردەمدا کۆکراونەتەوە: سەردەمی پەیامبەرایەتی، سەردەمی سەحابەکان- خەلیفەکانی راشدین. کۆکردنەوەکەشی بە دوو شێوازبووە.

١) ئەز بەرکردن و دەربڕین، ٢)نووسین و رازاندنەوە.

پەیامبەر بۆ خۆی لەسەر شێوەی یەکەمیان بوو، کە لەلایەن جوبرائیلەوە هەموو ساڵێک بۆ یەکجار پێی دووبارە دەکردەوە و لە ساڵی مردنەکەشیدا بۆ دواجار پێی دووبارە کردەوە. لە فەرموودەیەکیشدا پەیامبەر جارێک بە موسای ئەلئەشعەری، کە لە خوێندنەوەی قورئاندا ستایشی دەکات، دەبێژێت" لقد أعطیت مزماراً من مزامیر آل داوود" (البخاری).

-زوڕنایەک لە زوڕناکانی ئال داوودم پی بەخشراوە. هەرچی شێوەی دووەمیشە، نووسەرانی سرووش پێیهەڵساون. لەوانەش زەیدی کوڕی ثابت و ئەبی بن کەعب کەبەر لە ئیسلام بوونی،

زانایەکی جوولەکە بووە و هەر ئەویش کتێبی (الصلح لأهل بيت المقدس)ی نووسیوە و لە سەردەمی عوسمانی خەلیفەشدا لە کۆکردنەوەی قورئاندا بەشداریی کردووە. هەروەها لە نێوانیشیاندا معاز بن جەبەل، معاويە بن ئەبی سفیان و خەلیفەکانی راشدین. ئەوان ئایەتەکانیان لەسەر لاسکی گەڵای خورما و پانە بەرد و پێست یان گەڵا و (الأقتاب، ئەو تەختەیەی لەسەرپشتی حوشتر بۆ سواربوون دادەنرێت) و ئێسکیش، دەنووسی. کۆ دەنگی لەسەر ئەوە هەیە، کە لەسەردەمی پەیامبەردا هەموو قورئان نووسراوەتەوە بەڵام لەکتێب یان مەسحەفێکدا کۆنەکراوەتەوە وەکو ئەوەی کە هەیە. تەنیا لەسەردەمی عوسماندا نەبێت.

دەگێرنەوە کە لەسەردەمی ئەبوبەکری خەلیفەی یەکەم، پێشنیاز کراوە قورئان بە ( السفر) ناوببرێت، ئەویش وتوویەتی کە ئەو ناوە ناولێنانی جوولەکەکانە، هەربۆیە پێشنیازی کردووە کە بە (المصحف) ناوببرێت، کە لە دابونەریتی حەبەشەوە وەرگیراوە.

لەسەردەمی عوسماندا خوێندنەوەکانی قورئان فرە بوون. خەڵکی شام بە خوێندنەوەی أبی بن کعب و خەڵکی کووفەش بە خوێندنەوەی عبداللە بن مسعود و خەڵکانی دیکەش بە خوێندنەوەی أبی موسی الأشعری خوێندوویانەتەوە. تاخەریک بووە جیاوازی خوێندنەوەکان بۆ کێشمەکێش و پەرتەوازەی بگۆڕێت و هەندێ لە موسڵمانەکانیش یەکتری بەکافر بکەن. بەم شێوەیە عوسمان هەموو نوسخەکانی قورئانی لەیەک نوسخەدا کۆکردەوە و فەرمانیشیدا بە سوتاندنی ئەوانیتر، ئەویش لە ساڵی ٢٥ی کۆچیدا. کۆکردنەوەکەی ئەبوبەکریش لە ساڵی ١٢ی کۆچیدا بوو.

ئەو نووسەرانەش کە دوانوسخەی ناسراو بە مەسحەفی عوسمانیان دانا، چوار کەسن: زیدبن ثابت، عبدالله بن الزبير، سعيد بن



العاص، عبدالرحمن بن الحارث بن هشام. سیانەکەی دواییان قورەیشین و ئەوەی یەکەمیشیان لەئەنسارە. عوسمانیش پێیگوتوون: ئەگەر ئێوە و زیدبن ثابت لە شتێکی قورئاندا جیاوازبوون، ئەوا بەزاری قورەیش بینووسنەوە، چونکە بەزاری ئەوان دابەزیوە (صحيح البخاری٦/٩٩).

رەنگە هەندێ لە خوێنەران پاش خوێندنەوەی هەموو ئەوە بپرسن: ئەوانە بەڵگە نەویستن، ئیتر بۆچی بۆمان دووبارە دەکەنەوە؟ وەڵامی منیش ئەمەیە: لەبەر ئەوەی کە بۆ ئەوانەش کە رێگەم دەدەن بەردەوام بم، دەڵێم: ئەوەی بەڵگە نەویستییە ئاڵۆز بوونە.

-٧-

دەقی قورئانی بەو وەسفەی دەقێکی زمانەوانییە، شێوەی دەریایەکە، کە شەپۆڵەکانی دەستلەملانی یەکدەبن و تێکدەئاڵێن، لەسەرەتا و لە کۆتایشیدا.

سەرەتاکان لەناوەند و کەنارەکاندا شەپۆل دەدات و پێچەوانەکەشی راستە. ئەمە لەڕووی فۆرمەوە. پوختەی قسەکانی پێشوو: شیعر و گوتار و پەند و حکمەت لەلای عەرەب بووە بەر لەئیسلام، هەروەها نووسینی بابلی- کەنعانی ئارامی و، نووسینی تەوراتیش.

قورئان، دەقێکە باس لە هەمووشتەکانی ناوسروشت و پشتەوەشی دەکات و دوودڵیش نیشان نادات لە دووبارەکردنەوەی ئەوانەی پێش خۆی. نووسینەکانیشی بە فۆرمی جیاواز و وەسفکردنی خۆشی لە هەمان کاتدا بەوەی کە کۆتایی پەیامەکانی پێغەمبەرایەتییە و کۆتایی ئاخاوتنیشە. هەروەها وا خۆشی پێشکەشدەکات بەو وەسفەی کتێبێکی

سەراپاگیر و تەواوە. دواتریش بەو وەسفەی ئەلتەرناتیفی سەرجەم کتێبەکانیشە.

لەڕووی تەکنیک و دروستکردنیشەوە، پشت بە دیالۆگ و گێڕانەوە، حکمەت و پەند دەبەستی. لەیەک کاتیشدا یاسادان و ستایشیشە. لاپەڕەشی تێدایە، دەکرێت بەو وەسفەی شیعرێکی ئەبستراکتە، بکۆڵرێتەوە. لاپەڕەشی تێدایە، دەشێت وەکو "باشترین چیرۆک" تەماشا بکرێت. هەموو خوێنەرێکیش دەتوانێت لە تێڕوانینی دیاریکراو بۆ شیعر و فیکر، چەمکی تایبەت بە مرۆڤ و گەردوون و میتۆدێکی روون بۆ روانین لە ئاکار و مەرگ و ئەڤین و سروشت و میتای پوخت بکاتەوە. لێرەدا دەق بەهێڵێک پەرە ناسێنی، بەڵکو لە بۆشایی فرە ئاراستە و فرە رەهەندا گەشە دەکات، هەروەکو بونیادی ئەندازەیی نا ئیقلیدسی.

ئەو کتێبەیە کە وەسفی مالارمیەی بۆ کتێب لەسەر جێبەجی دەبێت و خەونی بە نووسینییەوە بینیوە:" کانیاوی هەقیقەتە و هەموو مرۆڤایەتیش لێیدەخواتەوە" (المرسلات، الجزء الرابع،ص٨٧).

بەو وەسفەی نووسراوێکە، ئەوانەی پێش خۆی لە ئایینی و دونیایی تێدەپەڕێنی: ئایین بە زمانی شیعر گەرایی و دونیاش بە زمانی ئایینی دەنووسێت و لە تەوەرەگیریشیدا بناغەیە لەسەر زمان، کە جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە کە بوونەوەر لە کرۆکدا زمانە. ئەم تەوەرەگیرییەش لەسەر زمان وایلێدەکات کە بابەتیانە ببێتە دەقێکی ئەدەبی. بەو وەسفەی کتێبیشە چەمکی نووسەر-تاک رەتدەکاتەوە. وەکو ئەوەی بێژیت: نووسەر کۆیە نەک تاک.

سروشتییە، ئەم بارە هاوشێوەی شتێکی دەرەکی نەبێت. رەگەزێکی کتێبی بێت بۆ خۆی و لەخۆیدا: پەخشانێکە نەک وەکو پەخشان، شیعرێکە نەک وەکو شیعر نووسراوێکە نەک وەکو



نووسراو، زمانێکە نەک وەکو زمان. سەرەتا و کۆتاییە: نووسینە لەئاستی گەردووندا.

-٨-

ئەم ئاخاوتنە دەمانگوازێتەوە بۆ ئەو دژوارییەی کە موسڵمان لە تێگەیشتنی بۆ دەقی ئایینیدا دووچاری دەبێتەوە. نموونەیەک لەسەر ئەم دژوارییە بە دوو مەسەلە دەهێنمەوە: یەکەم، پەیوەستە بە بونیادی دەق و دووەمیش پەیوەستە بە خوێنەرانیەوە.

لەڕووی یەکەمەوە، عەرەب لە راڤەکردنی دەستپێکی هەندێک لە سوورەتەکان واقی وڕماوە. ئەم دەستپێکانە هەمە جۆرن. هەیانە بەیەک پیت لەسی سوورەتدا دەستپێدەکات:صاد، قاف، القلم، ئەم سوورەتانەش بەم پیتانە دەسپێدەکەن بەدواییەکدا: ص، قاف، نون.

هەشیانە بەدوو پیت دەستپێدەکات، کە دە سوورەتە. لەم دە سوورەتەش بەهەمان پیت دەستپێدەکات: حم (حاء میم) کە بریتین لە: غافر، المؤمن، فصلت، الزخرف، الدخان، المائدة، الاحقاف. سیانی تریش بەدوو پیتی جیاواز دەستپێدەکەن: طە (طاء هاء) طس (طاء سین) و یس (یاء سین). هەشە بە سی پیت دەستپێدەکات کە سیانزە سوورەتە. شەشیان بەپیتەکانی ئەلف لام میم (البقرة، آل عمران، العنکبوت، الروم، لقمان، السجدة) دەستپێدەکات. پێنجیشیان بە پیتەکانی ئەلف لام راء کە (یونس، هود، یوسف، أبراهیم، الحجر)ە دەستپێدەکات. دوانیشیان بەپیتەکانی گاء سین میم، کە الشعراء، القصص، دەستپێدەکات. هەشیانە بە چوار پیت دەستپێدەکات: یەکەم سوورەتی الاعراف، کە بە: ئەلف لام میم صاد، سوورەتی الرعد بە: الف لام میم راء دەستپێدەکات.

دوو سوورەتیش هەن بە پێنج پیت دەستپێدەکات، پیتەکان لەیەکەمدا بریتییە لە سوورەتی مریەم کە پێکەوەلکاون، کاف هاء صاد

عەین صاد. پیتەکانیش لە دووەمدا بریتییە لە الشوری کە پچڕاون، ئەویش حاء میم،ە پێکەوە. پاشان عەین سین قاف پێکەوە. سەرجەم سوورەتەکانیش بە بسم الله الرحمن الرحیم ئاراستە دەکرێت جگە لە التوبە نەبێت، کە ئەم ئاراستەکردنەی تێدا نییە.

رەنگە هەندێکیان لەم پیتانەدا بەشێوەیەک لەشێوەکان، پیتەکانی لای رامبۆیان لە قەسیدە ناسراوەکەیدا بەبیربێتەوە، وەلێ ئەز ناچمە ئەوەوە و ئاخاوتنم لە واقورمانی عەرەب لە راڤەکردنی کورت دەکەمەوە. سەرجەم باوەڕگەکان بەشدارییان لە لێکدانەوە کردنیدا کردووە و بەبڕیاری پەنهانی کۆتاییان هاتووە، کە لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێت. ئەویش لەبەر ئەوەی "زانستی شاراوە و نهێنی داپۆشراوە" کە خواوەند بە تەنیا بۆ خۆی تەرخانکردووە.

بەئاماژە کردن بە هەندێک لە لێکدانەوەکان ئیکتیفا دەکەم. ئەهلی سوننە دبێژیت ئەم پیتانە ئەگەر لەسەر " هەژمار کردنی راستەکان" هەژمار بکرێت، پاش ئەوەی  دووبارە کراوەکانی لێلابرا ئەوا لەگەڵ ئەم وتەیە "صحّ طریقک مع السنّة" دێتەوە. ئەهلی شیعەش دەڵێن ئەگەر ئەم پیتانە دووبارەکراوەکانی لێلابرا ئەوا لەگەڵ وتەی "صواطُ علیّ حقٌّ".

ابن عربی، بۆچوونێکی تری هەیە، ئەو وایدەبینی ئەم پیتانە پلەدارن، هەیانە پێکەوەلکاون و هەشیانە بچڕاون. هەر تاک و جووت و کۆیان هەیە. تاکیان ئاماژە بە لەناوچوونی مرۆڤی تاک دەکات، کۆشیان هێما بە بۆ هەمیشەیی. تاکەکان بۆ دەریای ئەزەلییە و کۆیەکانیش بۆ دەریای ئەبەدی. جووتەکانیش بۆ ماوەی نێوان دونیا و زیندووبوونەوەی دوارۆژی موحەممەدی مرۆیی. (الالف) ئاماژەی یەکبوونە، (المیم) ئاماژەیە بۆ ئەو پادشایەی کە لەناو ناچێت. (اللاّم)یش لە نێوانیاندا پەیوەندییە. ئەوانی دی دەڵێن ئەم پیتانە



هاوشێوەی دەستپێکی هەندێک قەسیدەیە. ئەوەی پەیوەستیشە بە خوێنەر، راڤە کردنەکان بۆ دەقی قورئانی فرە جۆرن.

بەر لەوەش مەرجی ئەوە دانراوە، کە هەر کەسێک راڤەی قورئان دەکات، دەبێت شارەزای تەواوی زمانی عەرەبی بێت لەرێزمان و وتەسازیدا، لە داتاشینیدا، لە زانستەکانی رەوانبێژیدا، لەزانستەکانی خوێندنەوەدا. لەئەسڵەکانی ئایین و زانستی ئایینیدا.

لەهۆکارەکانی دابەزین ( النزول)، لە ناسخ و مەنسوخدا، لە فەرموودەکانی پەیامبەردا، ئەم مەرجانەش وا لە مرۆڤ دەخوازێ رۆشنبیرییەکی بەرفراوانی هەبێت، ئارەزوویەکی زۆر، باوەڕێکی قووڵ. ئەم مەرجانەش لە هەموو مرۆیەکدا بوونیان نییە. بەم جۆرە راڤەکردن هەمەرەنگ بوو کەدەکرێ لەشەش جۆردا دیاری بکرێت: راڤەی تەقلیدی کە لەسەر گواستنەوەی پشتاوپشت (المأثور) راوەستاوە. راڤەکردن بە بۆچوون و ئیجتیهاد. راڤەکردنی سۆفیگەرایی، راڤەکردنی فەلسەفی، راڤەکردنی فیقهی، راڤەکردنی زانستی راڤەکردنی کۆمەڵایەتی، راڤەکردنی ئەدەبی.

-٩-

ئەمە بە شێوەیەکی گشتی، هەڵوێستی ئەوانەیە کە باوەڕیان بە دەقی قورئانییە. هەروەها بۆ ئەوەی هەڵوێست لە بەرامبەر ئەم دەقە تەواوبێت، پێویستە ئاماژە بەوانە بکرێت کە تەقەلایان داوە  نەیاربن یاخود هاوشێوەی بهێنن. لەنێو ئەو کەسانەش کە بانگەشەی پەیامبەرایەتییان کردووە، نموونەی موسەیلەمەی ئەلنجدی کە بۆ پەیامبەری نووسیوە و دەڵێت: "لەزەویدا لەگەڵتدا هاوبەشم، ئێمە نیوەی زەویمان هەیە و قوڕەیشیش نیوەکەی تری، بەڵام قوڕەیش نەتەوەیەکن دەستدرێژیدەکەن".

بانگەشەی ئەوەشی دەکرد، کە قورئانێکی لە ڕێگەی فریشتەیەکەوە بەناوی ( رەحمان)ەوە بۆ دابەزیوە، لە نێو ئەو کەسانەشدا کە بانگەشەی پەیامبەرایەتی کردووە. عبهلە بن کعب، الاسود العنسیّ، طلیحه بن خویلدا الاسویً، النیر بن الحارث، لە نێویشیاندا ئافرەتێک هەیە کە بە سجاح ناودەبرێت.

کەسانێکیش کە بانگەشەی پەیامبەرێتییان نەکردووە بەڵام هەوڵیانداوە دژایەتیی بکەن. لەوانە وەکو دەگێڕنەوە، نووسەری بەناوبانگ ابن المقفع، شمس الدین قابوس بن شمکیر الدیلمی، ابن الراوندی کە دەڵێت لە هەموو کتێبەکانیدا دژایەتی قورئانی کردووە: الفرید، الرموّده، قضیب الذهب، المرجان- لەو کتێبانەن کە بە دەستمان نەگەیشتووە. لەوتەیەکی کتێبی " الفرید" دا:" موسڵمانان نارەزاییان لە پەیامبەرێتی پەیامبەرەکەیان بە قورئان دەربڕیوە. پەیامبەریش تەحەددای پێکردووە و نەیتوانیوە دژایەتی بکات. بۆیە پێیان دەڵێت: پێمان رابگەینن ئەگەر لە فەیلەسووفان وەکو بانگەوازەکانتان لەقورئاندا بانگەوازیان کرد، هەروەها دەڵێت: بەڵگەی راستگۆیی بتلیمۆس یاخود ئقلیدس، ئەوەیە کە ئقلیدس بانگەشەی ئەوە دەکات کە خەڵکی بێتوانان لەوەی کە کتێبێک لە چەشنی کتێبەکەی بهێنن، ئاخۆ پەیامبەرایەتی جێگردەبێت؟ دەشگوترێت کە هەردوو شاعیری گەورە " المتنبی، المعری" هەوڵیان داوە دژایەتی قورئان بکەن.

-١٠-

ئەم دەقە کە بە کات، یان شوێنەوە پەیوەست نییە، بۆ هەمووکات و شوێنێک دەبێت، بە تەنیاش لەسەر بابەتێک بەبێ ئەوەیتر ڕاناوەستێ، بەڵکو دەقێکی هەمەکییە، کە نەخودی و نەبابەتیشە، دەقێکە گەردوونییە؛ کە ئاراستەی گرووپێکی دیاریکراو نەکراوە یان



چینێکی دیاریکراو، بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤە؛ بێ هیچ جۆرە جیاوازییەک. ئەم دەقە "وشەکانی تەواونابن" و لەکار ناکەوێت- ئیدی ئەم دەقە چلۆن تێگەیشتنمان بۆ نووسین ناهەژێنی، چۆن لەبەردەمماندا ئاسۆیەکانی نووسین ناکرێتەوە، کە نە هاوشێوە و نە سنووری هەیە؟

هەر لەسەرەتاوە داوامان لێدەکات کە لە کۆت و بەندی پۆلێنکردنی خۆریی نووسین قورتار بین. خۆ ئەگەر نووسەر لەم کۆت و بەندە قورتار بوو، بەلای ئەندێشەی دروستکەر و دینامیکیەتی تێڕامان و ژاوەژاو دایدەشکێنێتەوە و جۆرێک لە کەنارە بزۆزەکان دەخوڵقێنی. بەلای وزەی زمانی- سەرەتای هەمیشەییدا لادەدات کە چەشنی بزاڤی شەپۆلی تێهەڵچووی بەردەوامە. بەلای زمانی- ژیاندا، واتە روو لە ژیانی زمان دایدەشکێنی.

نووسینی لە بازنەی سنوورەکان کە بە جۆرەکان دابەشیدەکات، دەردەچێت و وشەکانیش دەبێتە هاوشێوەی هێل و دەنگەکان لە کەڤاڵدا. هەروەها کەڤاڵیش بە جۆرێکی پێودانگی لەدەرەوەڕا دیاری ناکرێن. بەڵکو لە میانەی خۆیدا و لە چێبوونی خۆیدا دیاری دەکرێت، لە هارمۆنی رەنگ و هێڵەکاندا. هەروەها دەقی نووسینیش لەدەرەوەڕا بە ڕێسایەک یان بە پێوەرێک دیاری ناکرێت. بەڵکو بونیادی خۆی لە هارمۆنی وشەکان و چنینیدا دیاریدەکات. بەم جۆرە هەر دەقێک یاسایەکی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەگەر پێویست بکات قسە لە یاسایەک بکرێت، ئەوا یاسا بە دوای دەقدا دێت و لەوەوە هەڵدەهێنجرێت. پێویستیشە نووسینی عەرەبی بەم ئاسۆیەدا بڕوات: نووسینێک فۆرمەکانی دابهێنێت لەوەی کە دەنووسرێت.

# شیعر و رۆشنبیریی ناشیعری

-١-

لەریشەی وشەکەدا "دژوار"ە، ئەو واتایانەش کە ئاماژەن بۆی لە زمانی عەرەبیدا، وێنایەکن دەشێت بەسوود بن بۆ روونکردنەوەی فۆرمەکانی پەیوەندی نێوان قەسیدە و خوێنەرانی. بۆ نموونە، بەسەر چیایەکی سەخت و بەرزدا هەڵگەڕێین یاخود حوشترێک لێمان بەلەسە بێت و نەتوانین دەستەمۆ و رامی بکەین. یان ئاواتێکی دوورە دەست کە نایەتەدی. یاخود گەواڵەهەوری باراناوی  بە بروسکە و تریشقە: هەموو ئەمانە وێنای لێکوژی سانایین. کاتێکیش عەرەبی وەسفی شیعر بە دژواری دەکات، لەوەسفکردنیدا ئەم خەسڵەتانە- هەندێکی یان هەمووی بە نهێنی لەخۆدەگرێت: بەدەربڕینێکیتر ئارەزووی خوێنەر یان بیسەری بۆ ئەوشیعرەی کە ئەم خەسڵەتانەی لەخۆ نەگرتووە دەشاردەوە.

ئەو شیعرەی کە بە ئاسانی لێتێدەگەیت، وەکو ئەو هەورەیە، کە بەبێ بروسکە یان تریشقە دادەکات، یان رێگەیەک بەبێ هەوڵدان دەگرێتەبەر، یاخود ئەو ئاواتەی بە ئاسانی بەدیدێت. یان حوشتری ماڵی. داوا لە قەسیدە دەکرا؛ کە سانا بێت بە شێوەیەک کە بتوانرێت لەڕووی فیکرییەوە کۆنترۆڵ بکرێت و بە ئامرازە مەعریفییەکانی ببێتە خاوەنی. لەبەر ئەوە لەهەر قەسیدەیەک هەڵدەهاتن کە بەپیر ئەم ئارەزووەوە نەدەچوو. هەروەها خەسڵەتی دژواری پیا هەڵدەدرا. ئەم خەسڵەتەش لەزۆر جاردا شتێک لە بەدگۆیی هەڵدەگرێت. شاعیری دژواریش بەوە وەسفدەکرا کە بەرد دادەتاشێت و ساناییش بەوە وەسفدەکرا، کە پڕکردنی مشتە لە دەریا.





ئەوە ئەو کەشە گشتییەی پەیوەندی نێوان قەسیدە و بیسەرانێتی بەر لە ئیسلامدا، لە قۆناغێکی سەرزارەکیدا. ئەم کەشە لە ئیسلامیشدا بەردەوام بوو، کە لەگەڵ دەسپێکی نووسیندا رەهەندێکی دی وەرگرت کەدەشێت بەر لەناونانی بە ئایدیۆلۆژیا ناودێری بکەین. لەمەشدا هۆشیاری دەخوازێت بۆ تەماشاکردنی موسڵمانی عەرەب لە زمانی عەرەبی، لەلای هەر کەسێ کە لە شیعری ئەم زمانەدا بدوێت. ئەم زمانە بەر لە ئیسلام، بت پەرست بووە، پاشان بە سرووش بووەتە ئیسلامی خوداوەندی - بی ئەوەی هیچ شتێکی تیادا بگۆڕێت. لەوەشدا میهرەبان یاخود دایکی ئاخاوتنی خودا و شیعرە، کە بت پەرستی بووە لەو دەمەشەوە کە سرووشی خواوەندێتی جێگەی سرووشی شیعری بە ئایینی و مەعریفی گرتەوە، سرووش، شیعری لە گوزەرانی شاهانەی وەدەرنا و خۆشی وەکو تەنیا چاوگی مەعریفە پێشکەش کرد. بەم جۆرە شیعر هەقیقەتی نەدەگوت، وەکو ئەوەی بەر لە ئیسلام شاعیران بانگەشەیان دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە پێویستی بە توێژینەوەیەکی تایبەت هەیە.

ئیسلام فۆرم یان شێوازی دەربڕینی رەتنەکردەوە، بەڵکو رۆڵ و بانگەوازی مەعریفی رەتکردەوە و وەزیفەیەکی تازەی پێبەخشی: شکۆدار کردنی هەقیقەت کە پەیامبەرێتی ئیسلام هێنای و مژدەی پێیدەدا. ئەمەش بەواتای داماڵینی لە شوناسی یەکەمی- بینگەیی و کەشفکردن- و کردنی بە ئامرازێکی راگەیاندن.

ئیسلام بەو وەسفەی پەیامبەرایەتییە، بریتیشە لە پراکسیس کە تیایدا ئاخاوتن و کار یەکدەگرن. لێرەشە رەهەندێکیتر دەردەکەوێت، کە رەهەندی سیاسییە و پەیوەست دەبێت بە بەرهەمی ئەدەبییەوە لە

نزیککردنەوەی شیعر و نووسینەکانیتر کە خزمەت بە پەیامی ئیسلامی دەکەن. هەروەها دوورخستنەوەی ئەوانەی کە خزمەتی پێناگەیەنن- پەراوێزکردن، یاخود نەهێشتنی یاخود قەدەغەکردنی.

ڕەنگە لێرەدا تۆوی یەکەمی بەکارهێنانی هونەر وەکو ئایدیۆلۆژیا ببینینەوە. دیسان تێبینی ئەوە دەکەین؛ ئەوەی کە کێبڕکێتی شیعری کرد و دەشیکات لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا، زانست و فەلسفە نییە، بەڵکو ئایینە.

چونکە شیعر بە مەدلولی عەرەبی ڕەسەن بەر لە ئیسلام، سرووشە. واتە بریتییە لە پەیامبەرێتی بەڵام بێ تەعالیم و بێ دامەزراوەکان و بێ سیستمەکان. ئەوەش زیاد دەکەین کە ئەمە پێویستی بە توێژینەوەی تایبەت هەیە. شیعر لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا هەر لەسەرەتای ئیسلامەوە سووکایەتی و خراپەکاری پێکراوە، هێندەی ئەوەش ئیماندارییان مژدەبەخش و پابەندی سیاسی و ئایدیۆلۆژیاش بووە.

ئەمەش ئەوەیە کە ڕەخنەگری ( سەدەی هەشتەمی زایینی)، الاصمعی لە پەیڤە بەپێزەکەیدا ئاماژەی پێدەکات :"شیعر ژیان لێتاڵبووە و دەرگاکەشی شەڕخوازە، خۆ ئەگەر بشچێتە نێو چاکەخوازی بەدکاردەبێت".

دەکرێت لەم ڕووناکییەوە، وێنای ئەو سەرەڕۆییە دەگمەنە بکەین، کە شیعری عەرەبی دەستی داوەتێ و لە زمانی یەزدانیشدا بەرپایەدەکات، هەروەها لە کۆمەڵگەیەکیشدا کە بەدامەزراندنی بنچینەیی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری سیاسی بەسەر ئەو سرووشەی کە بەم زمانە دایبەزاندووە، هەڵدەستێت.



-٣-

لەکاتێکدا سرووش لە دامەزراوەکاندا بەرجەستە دەبوو، دامەزراوەکان جگە بەو وەسفەی ئامرازی خزمەتکردنیەتی، نەیدەڕوانییە شیعر. لەژیانی ڕۆژانەی عەرەبیدا پەیوەندی تازە لە نێوان شیعر و وەرگرڕا چێدەبوو، هەروەها شێوازی تازە لە چێژ وەرگرتنی شیعر بەپێودانگ و بەها تازەکان دامەزرا. دامەزراوە سیاسی- ئایینەکانیش بەو وەسفەی گاردی ئاسایشی سرووشی ئیسلامی بووە، مومارەسەی دەسەڵاتی خۆی دەکرد. بەو وەسفەش کە باوەڕی تەواوی بە یەقین هەبوو، ئەم سرووشە رابەرایەتی مرۆڤ و گەردوون و کتێبەکانیانی کردووە، بێ چەوتی یان کەم و کورتی و بەشێوەیەکی ئاشکرا و کۆتایی. ئەم یەقینەش واپێویست دەکات، تاکی موسڵمان دروستبکات کە ئیمانی بە دەقی ڕەها هەبێت، بی پرسیارکردن کە ببێتە هۆی هەر جۆرە گومان کردنێک لێی. لەم جۆرە دروستکردنەدا خود پێش وەخت بە تالان براوە. بەڵکو منی پرسیارکەر بوون و جێگای نییە. ئیسلامیش وەکو ئەوتێگەیشتنە باوەی کە دواپەیامی ئاسمانییە بۆ ڕۆڵەکانی زەمینی ڕەوانەکردووە و کۆتایی ئاخاوتنی خوداوەندیشە، ئەوا سەرجەم قسەکان بەدوایدادێن، بەتایبەتیش قسەی مرۆڤ. کە ناکرێت تازە بێژیت و هەموو بانگەوازێکی نا ئاشناش بەنیسبەت ئەوتێگەیشتنە شاراوەیی تێدایە... وتنی ئەوەی ئەم پەیامە هەموو شتێکی نەگوتووە و کەم و کورتی تێدایە، نەزانراو هەیە و سرووشی خواوەندێتی ئاشکرای نەکردووە. بەم جۆرە پێویستە ئاخاوتنی مرۆیی ستایشکردنی ئەم پەیامە بێت. شکۆدارکردن بێت، لەڕووی فیکریشەوە، لەدوورترین باردا جگە لە راڤەکردن ناکرێت هیچیتر بێت.

نووسـین لـەم چوارچێـوەیـەدا بـەدیـاریکراوی روونکردنـەوەیـە.
شیعریش کە بەرزترین پلەی دەربڕینە، بەها و بایەخی خۆی بەپێی پلەی روونێتی بەدەست دەهێنێ. بە پشت بەستن بەمە پێویستە شیعر، بـەو وەسـفەی ئـامرازی لێکدانـەوە و فێربوونـە، سـانابێت کـە هـەر سانایيشە وایلێدەکات خێرا بڵاو بێتەوە و، کاریگەریی بەهێز تر بێت. بگرە ئەم سانایيەش وا لە قەسیدە دەکات ببێتە شمەکی بەکاربردن. خۆ ئـەگـەر ئـەم سـانایيە بیـرەوەریـی شـیعریی دووبـارە بکاتـەوە، وەهمگیر دەبێت بەوەی کە یەکگرتن لە نێوان ئێستا و رابردوودا پێکدێنی و بەدیهێنەری پێداویستییە راستەقینەکانی مرۆڤ دەبێت. بەوەش بێهۆش دەبێت نەک رزگاربێت. وەکو ئەوەی خەڵکی فێردەکات بـەندیخانـە و کـۆت و بـەنـدیان بـە هـەمـان ئـارەزوو و پێداویـستی دروستبکەن. ئەم سانایيە مرۆڤ بەرەو رابردوو دەگەرێنێتەوە و وزەیەکیش نابێت کە بە ئاراستەی داهاتوودا پاڵی پێوەبنێت.

لەمەدا شتێک هەیە، کە راڤەی هەژموونگەرایی دەکات و من بە رابردوویێتی بەسەر بیرکردنەوەی عەرەبی باودا ناوی دەبەم مەبەست لە رابردوویێتی – الماضویە- لەسیاقی توێژینەوەکەمان رەتکردنەوەی نـەناسـراوی نامـەئلـوف و رۆچوونـە تیایـدا. دیـسان لـەوەدا ئـەوە لێکدەدرێتەوە کە چۆن ئەم بیرکردنەوەیە کاتێک رووبەڕووی شیعر یان فیکرێک دەبێتەوە، راستەوخۆ لەوەوە هەڵناقوڵێت کە دەیزانێت، یەکەمجار هەڵدەدات بە بەراورد لەگەڵ پاشماکی ئایینی زمانەوانی لێتێبگـات. واتـە لـەگـەڵ ئـەوەی کـە دەیزانێـت. بـەوەش هێنـدێک دوورکەوتنەوە دەبێت، لەم دەرئەنجامە دەڕوانێت بەو وەسفەی نامۆ و مەترسیدارە و هەڕەشە لە پاشماکی دەکات. گرنگ ئەو روونێتییەیە



کە لە هێڵی ئاشکرای راستەوخۆدا هاتووە، کە بە شێوەیەکی ئۆرگانی ئێستا و رابردوو پێکەوە گرێدەدات.

کە وابوو ئامانجی کۆتایی لەشیعر، تێگەیاندنی خوێنەر یان گوێگرە لە ناوەرۆکی، پتر لەوەی ئاشکراکردنی خودی شاعیر بێت، هەروەها روانینی تایبەتی بۆ مرۆڤ و جیهان. بەهای قەسیدەش لە کاریگەری و کـارایی و ئاسـتی بـە پیـرەوەهاتنیـدا شـاراوەتـەوە. شـیعریش لـەم روانگەیەوە وەکو هەر دامەزراوەیەک، دامەزراوەیەکە: بەهاوسەری بوونە نەک خۆشەویستی، گەیشتنە نەک سەرەڕۆیی، بابەتە نەک خود، مۆدەیە نەک وزە، کۆیە نەک تاک. لەهەموو ئەمەشدا پەرەسەندنی بەردەوامی بەها بەجێماوەکان و پاراستنە لە بەردەوامبوونی. لەوەشدا روانین لەبەرهەمی زمانەوانی وەکو بەرهەمی ئیشی دەست ئاماژەی پێدەکرێت؛ هەروەها لە روانینی زمانی شیعریش بەو وەسفەی شێوازی کارە، هەروەکو چۆن بەرهەمی کرێکار بە دەستە و شیاوی دەست و دەستکردنە، واتە شمەکە، ئەوا پێویستە لەسەر کرێکار بەزمانیش قەسیدە بەرهەم بهێنی، کە دیسان ئەویش شمەکە و شیاوی دەستاودەستکردنە و بەهاکەشی لەم بارەدا لە ئاستی توانای سەرنج راکێشانی خەڵکیدا شاراوەتەوە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ئامرازەکانی راگەیاندنی نوێ بە هەموو جۆرە و ئاستەکانیەوە، بە شێوە گەڵی کاردەکات تا زیاتر و زیاتر جیهان بە رووکەشی و سواو بکات و پاڵیش بە نووسینەوە بنێت لە نێویشیاندا شیعر، تا دەبێتە جۆرێک لە هەواڵ. هەروەکو ئەوەی لەوەدا بەتەنیا کاربۆ ئەوە نەکات نووسین رەتبکاتەوە، بەڵکو بۆ ئەوەشە خوێندنەوەش رەتبکاتەوە. بەچەشنی ئەوەی جۆرێکی تری نوێ لە رۆشنبیری گوێ و چاو دابمەزرێنی، مەبەستم لە جۆرێکیتری

تازەیە لە نەخوێندەواری. بەم جۆرەش چەمکی بەرهەمهێنان، جێگەی چەمکی خولّقاندن و بەرهەمهێنیش جێگەی خولّقێنەر دەگرێتەوە.

ئەم هەلومەرجە خاوەن رەهەندی گەردوونییە، بەنیسبەت کۆمەڵگەی عەرەبییەوە رەنگدانەوەی دەبێت لە دیاردەکانی تۆکمەبوونی تەقلیدگەرایی لە هەموو ئەوەی پەیوەستە بە نووسین، بەتایبەتیش، ئەوەی کە یاریدەدەرە لە گەڵاڵەکردنی ئیرادەی کوشتنی خودی خولّقێنەر یان بە زمانی نوێ بێژین کوشتنی نووسەر. بە جۆرێک دەقی شیعری دەبێتە وێنەی دونیایی بۆ دەقی پەیامبەری: ئەمە خواوەند دەیڵێت کە پەیامبەر جگە لە نێوەندکارێک چیترنییە، ئەمەش ئایین و ئەو گرووپانەی کە باوەڕیان پێیەتی دەیڵێنەوە، کە شاعیریش جگە لە نێوەندکار- وسط- چیترنییە.

دەبینیت ئەم دیاردەیە بناغەیەکی تۆکمەیە لە یادەوەری شیعرگەرایی مێژووگەراییدا. عەرەبی بەر لە ئیسلام دەستپێک لە رەوش و بۆنەدا قسەی دەکرد یان بێژین، راستتر: دەستپێک لەرووداو و- وشە، لە واقیع و- وشە. وشە لەلای دەستپێکەوە بە ژیان و بزاوت و کارەوە گرێدرابوو. کە دەستپێک جەستەییە. قەسیدەش بۆ ئەو چەشنی خۆراک بوو، کە لە هەڵسەنگاندنیدا پشتی بە چێژ دەبەست لەبەرباس خستنیدا- مەبەستم گوێگرتنی.

لەبەر ئەوە ئاخاوتن یەکەم نییە کە لە شیعردا دەیبینی، بەڵکو رەوش و بۆنەکەی بوو. بەوپێیەش چاوەڕێی ئەوەی لێنەدەکرد بچێتەنێو رەوش و بۆنەکەیەوە- لەگەڵ ژیان و جەستەی بدوێت. لە جوڵە و کارەکانیدا بەشداری بکات. کاردانەوەی راستەوخۆی کاتێک گوێبیستی دەبوو کە بڵێت: راستە، راستگۆیە یاخود پێچەوانە، نەک وتنی: جوان یان ناشرین. پەیوەندی شیعر بەوەی کە خۆشی دەویست



یان رقی لێبوە، بەوەی دەیسەلماند یان رەتی دەکردەوە بەهێزتربوو لە جوانی یان ناشیرینی.

مەبەست لەمەش لەڕووی ئیستاتیکییەوە ئەوەیە؛ کە پەیوەندی نێوان وشە و شت، یەکەمجار بەنیسبەت عەرەبی جاهلییەوە، ئاشکراکردنی نیگایەکی ئیستاتیکییانە نەبوو، بەڵکو لەبارەی هەڵوێست و هەلومەرجەوە بوو.

پەیوەندی نێوان رەفتار و ئاکاربوو. پەیوەندی " ئەدەب" بە واتای سەرەکی ئەم وشەیە کە ئاکار و رەفتارە. لەمەشدا بە گرنگی رێزمان لە نووسینی شیعر لەلای عەرەب لێکدەدرێتەوە. کە یەکەمجار ئاکارە، لەبەر ئەوە یەکەمجار پەیوەستە بە ئاکارەوە کە پرانسیب و رێزمانە. بیرۆکەی جوانی تەنیا لەودەمەدا دەرکەوت؛ کە عەرەبی دەستیکرد بەجیابوونەوە لە نێوان خۆی و واقیعدا و رۆڵێکی ئەفرێنەرانەشی بەخشییە خەیاڵکردنەوە. هەروەها ئەوەش زیاد دەکەین کە زمان لەجەستە و ژیان جیابووەوە، ئەویش بەهۆی نوێگەری تەکنەلۆژیاوە بە تایبەت، وایلێهات ماتریال دروستدەکرێت و نووسینیش بووەتە جۆرێک لە تەکنەلۆژیا. بەم شێوەیە شاعیر بۆ دروستکەرێک گۆڕدرا کە چارەسەری ماددەکان دەکات کە وشەکانە و بەرهەمێکی لێدروست دەکات کە قەسیدەیە.

لە هەموو ئەوەشدا- لەو کلاسیکییە رەسەنایەتییە، لەم وتووێژە تەکنولۆژیایەدا جەخت لەسەر روونێتی و راستەوخۆیی و لایەنەکانی راگەیاندن و ئایدۆلۆژیا لە نووسینی شیعر لەلای عەرەب دەکرێتەوە.

ئەم رۆشنبیرییە کە دامەزراوە؛ دامەزراوەیەکی ئایینی- سیاسی لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا هەیە کە پرسیاری رەتکردووەتەوە، بەو وەسفەی رۆشنبیرییەکە هەڵدەستێ بە وەڵام. بەم جۆرە دژوارییی یەکەم کە

شیعری عەرەبی ڕووبەڕووی بووەتەوە و دەشبێتەوە بە ئاراستەیەکی پارادۆکس، لەسانایی و ڕۆشنبیری ساناییدا شاردراوەتەوە.

ئەو ئاخاوتنەش کە بەشیعری سانا ناودەبرێت، ئاستەنگی یەکەمە لەبەردەم ئەفراندندا. ئەمە جگە لەوەی کە شیعری مژدە بەخش و شکۆدارکردنە، لە چەپاندنی چەپێنراو و ئەو قەدەغە کراوەی کە ناکرێت گوزارشتی لێبکرێت زیاد دەکات. هەروەها لە کەلێنی نێوان مرۆڤ و خۆیدا، لە نێوان خۆی و ئارەزووەکانی زیاد دەکات.

هەر شیعرێکی تریش لەبەرامبەر ئەمەدا بەزەرووڕەت دژواردەبێت. لەبەر ئەوەی بە کوشتنی زمان خۆی نەبێت ناتوانێت دەستپێبکات. هەروەکو ئەوەی ئەرکێک بێت بۆ ئەوەی دەستپێبکات. هەروەها بەنێو پارچەکانی زمان و فیکردا، واقیع و نادیاریدا کە پەرش و بڵاوبوونەتەوە ڕۆچێت. وەکو ئەوەی پێویست بێت لەسەری ببێتە ئەزموونێک کە سنووردار ناکرێت و کۆتایشی نایەت.

-٤-

شیعر گەڕانە بە دووی نەزانراودا کە ناکرێت پێی بگەیت، سنووردار ناکرێت و کۆتاییشی نایەت. لێرەوە پاش دژواری و سانایی، ئەو دژوارییە دێت کە دوورخستنەوە بەرهەمی دەهێنێ. ئەو ڕووناکییەی کە ڕەنگە ئەم دوورخستنەوەیە بیخاتە سەر نەزانراو کە لە تەشەنە سەندنی زیاد دەکات. بە ئاماژەدان بۆ قووڵتر و دوورتر، بەڵکو وەکو ئەوەی ئەم ڕووناکییە بۆ شەو ئاوەژووبێت. ڕووناکی ئاسۆی بەرفراوان بەسەر شەوی جیهاندا واڵادەکات. بەڵام ئەو سنوورەی کە شیعر لێی دەپەڕێتەوە بە فەزڵی ئەم ڕووناکییە ڕادەستی ناسنووردارییی دەکات. وەکو ئەوەی تاریکایی لە جووڵەی



ڕووناکی خۆیدا بەرفراوان بێت. شیعریش تەنیا هەر سنووری خۆی دەزانێت. ئەو جیهانە پەنهانەش کە ڕۆشن دەبێتەوە، هەر خۆشی ڕابەرایەتی شیعر دەکات ڕووەو جیهانێکی زیاتر نارۆشن.

لێرەدا، شیعر جۆرێکە لە نووسینەوەی نائامادە. زمانیش لە کۆتی نەریت و کۆتی بەکارهێنانی ئاسایی هەڵدێت. نووسین هەرکە لە خوێندنەوەی نزیک بوویتەوە، ڕەهەندی بەرفراوان بوون دووردەکەوێتەوە، وەکو ئەوەی تۆ لە ئاسۆدا گوزەر بکەیت، یاخود تۆ لە نهێنیدا دەجوڵێیت و هێندەی گەورەبوونی خوێندنەوەش، گەورەدەبێ.

ئەم نائامادەیە؛ واتایەکی دیاریکراو نییە کە پێی بگەیت. نائامادە لێرەدا "شتێک" نییە بەڵکو جووڵەیە. نووسینیش لێرەدا واتای وشەکان لە ئاسۆیەکەوە بۆ ئەویتر دەگوازێتەوە و، بۆ واتاش فەزایەکیتر و چێژێکی تری مەعریفی دەخوڵقێنێ. کە لەمەشدا ڕووبەڕوو بوونی نێوان ڕۆشن و پەنهان، واقیع و نادیار دەبزوێنێ و، پەیوەندییەکانی تر دەکاتەوە کە نهێنییە شاراوەکانی بوون بەرباس دەخات.

لێرەوە بایەخدانمان بە شاردراوەی ناواخن، لە بەرامبەر ئاشکرای ڕوون، بایەخدانمانە بە شێمانەیی و ئەندێشەیی لەبەرامبەر یەقینی و ئەقڵانی. بەمجۆرە خوێنەر لە ئەندێشەیی شێمانەیدا دەجوڵێت، لەکاتێکدا لە نووسینێکدا دەبزوێت کە لەدەرەوەی هەموو نموونەیەکە کە لەڕابردوودا مەرجەعیەتی نییە. خوێنەر ناگەڕێتەوە، تا بچێتە قەسیدەوە، هەروەکو چۆن دەچێتە باخچەیەکەوە و بە سانایی بەڕووبوومی بچنێتەوە. بەڵکو وەکو چوونیەتی بۆ نێو ژاوەژاو، یان وەکو ئەوەی بە سەرەڕۆیی هەڵبستێ. ئەوەی لێرەشدا بەدەستی دەهێنێ، بە هەوڵ دێتەدی و هەر بەتەنیا بەبیریش نایچنێتەوە یان

تەنیا بە دڵی، بەڵکو بە هەموو قەوارەی. نووسینێکە بەرێگایەکی نەزانراودا رووەو جێگایەکی تر دەگوزەرێت، کە پنتێک نییە پێیبگات. ئەو جێگایەش بزۆزە و بە بەردەوامی بەرەو جێگایەکیتر دەمانبات. زمانیش لەم نووسینەدا پەیوەست نییە بە ریزبەندییەکانی نووسینگەرایی و پۆلێنکردنەکانی، بەڵکو بە جووڵەگەری ئەزموون و ویڵ بوونییەوە پەیوەستە. ئەم نووسینە شیعرییە دەلاقەی گەورەی لە تەونی رۆشنبیری ئایینی باودا خولقاند. شتگەلێکی گوت کە پێشتر نەیگوتبوو، ئاماژەی بە شتگەلێک کرد، کە ناگوترێت. وێنەی یەقینی شێواند هەروەها یەقینگەرایی ئاخاوتن کە گوزارشتی لێکرد، شێواندی. دەرگاکانی بەڕووی ئەوانەدا والاکرد کە ناونانرێت، بەڕووی پیوار-غیاب-ی هاوتایی نێوان شتەکان و وشەکان، کەدەبێتە هۆی گومانکردن لە راستگۆیی ئاخاوتن، چ جایئەوە مرۆیی یاخود خودایی بێت. لەبەرامبەر دەقی ئایینی داخراوی تەواوبوودا، بەتایبەتی دەقێکی کراوەی ناتەواوبووی کراوەی پێشکەش کرد. لێرەوە دژواری کە بە دژواری هێرمۆنیتیکا- التأويل- یاخود دژواری - contrast - کاروخ، زمان لەم نووسینەدا زمانی سنوورەکە دەگاتە نێوان بینراو و نەبینراو، زمانی ئەو پەڕی رۆحیش لە هەردووکیاندا زمانی دوور و بڤەیە. نووسینێکە وشەکان زامدار دەکات و جیهانیش هەمان زام دەڵێت.

-٥-

جۆرێکیتر لە دژواری هەیە، کە پەیوەستە بە کۆنسێتی شوناسەوە، کە بەکۆمەڵگەی عەرەبییەوە گرێدراوە. بەتایبەتیش بە زمان و ئایینەوە. ئەم کۆنسێتە وەکو ئەوەی دەژی، خوێندنەوەیەکە هەڵوەستی بە سۆزدانی یەکێتی رەسەنایەتی، یەکێتی نەتەوە، یەکێتی زمان،



یەکێتی نیشتمان، یەکێتی دەسەلات. هەروەها بەو وەسفەی خوێندنەوەی ئایدیۆلۆژیایە، وایدەبینێ دەقی شیعری جێگای ململانێی بیر و رووگەکانە، واتە بۆ دەقی سیاسی دەیگۆڕێت. کاتێکیش ئەم خوێندنەوەیە لەخۆ سازانی ئەم دەقە لەگەڵ مەرامەکانی کورت دەهێنێ، بە دژوار ناوی دەبات. رەنگە خەسڵەتی تری بخاتە پاڵ و لەوە دەریدەکات کە شیعرە. خوێندنەوەیە کە مەعریفە و دەسەلات یەک پێدەگرێت، بەو پێیەی نێوان زمان و شوناس، نێوان هەقیقەت و هێز، یەک پێدەگرێت. لێرەدا بەواتای چەمکی شوناسی بە واتای لاهوتی تاکڕەهەندە و بە واتای فەلسەفیش ئایدیالییە فۆڕمی بنەڕەتیش تیایدا بریتییە لە جیابوونەوە لەویتر و ئیکتیفاکردن بە خود. ئەم چەمکە بە بەردەوامی و ناکۆتایی و دۆگمایی؛ وەهمگیر دەبێت. هەر لەم سۆنگەیەشەوە بە تۆکمەی و یەکێتی و جوداوازی لە بەرامبەر شوناسەکانی تر وەهمگیر دەبێت. ئەگەر زانیمان شیعر لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا پێودانگی یەکەمە کە تیایدا و لە رێگەیەوە بیاڤی ئینتیمای شاعیر و شوناسەکەی پێتاقیدەکرێتەوە. هەروەها دەشزانین کە تا چەند شاعیر بە پیر ئەوە دەچێت، کە لەنووسینەکانیەوە لەمەڕ چەمکی ئەویتر بۆ شوناس کە ناتاکڕەوێنی و نائایینییە، دەردەچێت.

شوناس هەر بەتەنیا هۆشمەندی نییە، بەڵکو ناهۆشیاریشە، هەر بەتەنیا راگەیەنراو نییە، بەڵکو چەپێنراو و خامۆشکراویشە، هەر بەتەنیا بەدیهاتووش نییە، بەڵکو ئەو پرۆژەیەشە - کە لە بەدیهێنانداید، هەر بەتەنیا بەردەوامی نییە، بەڵکو دیسان پچڕپچڕیشە، هەر بەتەنیا ئاشکرا نییە، بەڵکو پەنهانیشە.

کە وابوو لە ناخی ئەو یەکێتییە خەیاڵپلاوییەدا، جیابوونەوە هەیە. "من" یەکێتی نییە جگە لە رووکەش نەبێت، کە لە قووڵاییدا

لێکدەترازێت. "ئەویتر" لەناخی "من"دا، بە نەرێی و ئەرێی نیشتەجێیە لەبەر ئەوە جیابوونەوە نییە، بی بەیەکگەیشتن. شوناسی زیندووش لە نائۆقرەیی پەیوەندییە بە فەڕ و ناڕوونەکانی نێوان من و ئەویتر دایە. بی ئەوەش شوناس، شوناسی بەردوشتە، نەک شوناسی مرۆڤ.

بەتەنیا شوناس لە ناوەوە ڕا نایەت: بەڵکو کارلێکی زیندووی بەردەوامی نێوان " ناوەوە" و "دەرەوە"یە، بە شێوەیەک دەکرێت بگوترێت، شوناس ئەوەنییە کە سەلمێنراو و روونکراوەتەوە، هێندەی ئەوەی کە دەگوترێت و هێشتا روون نەکراوەتەوە.

بەدەربڕینێکی تر دەشێت بگوترێت شوناسی واتا؛ هەردەم لەوێنەیەکی بزۆزدا نیشتەجێ دەبێت. شوناس لە "بەرەوڕوو"دا، زیاتر وەکو لە "گەڕانەوە بۆ" بەدەردەکەوێت. لە کرانەوە دایە نەک لەچوونە نێو قۆزاخەوە. لەکارلێکدایە نەک لە ئیکتیفا و پشت تێکردن.

لە شیعر و ئەفراندنی هونەریدا بەگشتی، مەسەلەی شوناس لە ئیشکالییەتیدا پتر بەرچاو دەبێت. هەردەم شوناس لە زمانی شیعریدا جێگەی پرسیار کردنە. مرۆڤ بۆ خۆی لە ئەزموونی ئەفراندنییە هێندەی ئەوە نەبێت کە دەردەچێت لەوەی کە هەیە. شوناسەکەی مشتومڕە لە نێوان ئەوەی هەیە و ئەوەی کە دەبێت. بەو وەسفەی لە جەوهەردا ویستی خولقاندن و وەرچەرخانە. لەبەردەمیدایە زیاتر لەوەی لە دوایەوە بێت. بابێژین شوناس میراتێک نییە لە پاشمان، هێندەی ئەوەی ئەفراندنە کە فەراهەمی دەکەین. مرۆڤ بە پێچەوانەی هەموو بوونەوەرەکان ئەفراندنی شوناسی دەکات، پاشان ئەفراندنی ژیان و فیکری.



-٦-

وایدەبینین لە کۆنتێکستی رۆشنبیری عەرەبیدا، ئەوەی بەدژواری شیعر ناودەبرێت لە خودی دەق لە دایک نابێت، هەروەها تیاشیدا نەشاردراوەتەوە، بەڵکو لە دوو مەسەلە لەدایک دەبێت:

یەکەم: ئاستی رۆشنبیری و جۆرەکەی، دووەم: پەیوەستە بە بیاڤی هۆشیاری خوێنەر بۆ واتای شیعر و پرۆسەی ئەفراندنی و چۆنیەتی خوێندنەوەی. کەوابوو ئایا سروشتی نییە کە بگوترێت لە کۆنتێکستی ئەم رۆشنبیرییەدا شیعر، شیعرە هێندەی ئەوەی لە سانایی دەربچێتا کە داوای دەکات، هەروەها لەو روونێتییەی کە بۆی دەخوازێت.

ئاخۆ سروشتی نییە بێژین: نەخێر هیچ شیعرێکی دژوارنییە؟

## ناوەکان

-١-

زمـان کارناکـات، بـەڵکو نـاودەبرێـت. تایبـەتمـەنـدی یـەکـەمینـی نووسـینیش ئـەفراندنگـەرایـی شـتێکە لـە ماتریـال یـان لـە ناماتریـال. یەکەمجاریش دەرچوونە لە "ناوەکان" (ئاماژەکان، واتاکان، وێنەکان... هتد) کە نووسینی پێشتر لە بارەی ئەو شتەوە بۆی زیاد کردووە. نووسینی ئەفراندنگەراییش لەبارەی شتێکەوە بریتییە لە نووسینی ئەوەی کە لێیشاردراوەتەوە: نەناسراو، پەنهان، ئەوەی کە پێشتر ئاشکرا نەکراوە. کاتی زانراو دووبارە دەکەینەوە، قەتیسی دەکەین: تەقلید بەم واتایە قەتیسکردنی شتەکانە، قەتیس کردنی ژیان و فیکر و هەست و گشتیانە.

-٢-

با نموونە وەربگرین...

شیعری عەرەبی، بەر لە ئیسلام، یان لە پاشی، ناولێنانە لە (بیرۆکە، وێنە)ی شتەکان " جاهلییەت" یاخود "ئەمەوی" یاخود عەباسی.... هەندێک لەم شتانە لە گۆڕەپانی هەستەکان، ئەمرۆ، دامەزراندن، دەرچوون. لەهەمبەردا، شتگەلێک ئەوکات لە گۆڕەپانی هەستەکاندا نەبوون.

گرفت لەژیانی عەرەبیدایە، بەکۆمەڵایەتی و فیکری و سیاسیشەوە. لە پێکەوە لکانیدایە، لەبەر هۆیەک لە هۆیەکان. لەوەی کە بە هەمە



جۆرێی لە "ناو"ە پاشماکەکاندا ماوەتەوە، لە ڕەتکردنەوەی ئەوەی ڕۆچونێکی تازە لە هەمان شتەکاندا ئەنجامبدات بۆ داهێنانی واتا یان فیکر یان وێنە تازەکان. گرفت لە زمانی شیعری عەرەبیدا لەبەر هۆیەک لە هۆیەکان لەوەدا شاردراوەیە، کە یەکخستنی لە نێوان شتەکان و (ناوەکانیان) ئەنجامداوە.

(وێناکردن و فیکرە کلاسیکییەکانمان لە بارەیەوە). شاعیر ئەو هێزی یەکخستن و فشارەی نەماوە، بۆ هەمان ئەوشتانە بگەڕێتەوە (ئەوانەی ماونەتەوە یان دروستبوون) تا تیایدا تێڕابمێنێت و ئاماژەی تازەیان بۆ داهێنی. بەڵکو بووەتە پابەندبووی ئاماژە کلاسیک و پاشماکەکان. بەمجۆرە شیعری بەزەرووڕەت دووبارەکردنەوەی کلاسیکە: بە ڕاڤەکردن و تەقلید و دوپاتکردنەوە. لەوەشدا ناکرێت ڕاڤەی هەژموونگەرایی زمانی ئاشکرای حیکمەتگەرایی و متمانەگەرایی و ڕاڤەگەرایی و فێرگەرایی بکەین.

"ناوەکان" بەنیسبەت زمانی شیعرگەراییەوە، شاردنەوەیە لەبەر ئەوە ئەم زمانە ناگەڕێتەوە بۆ ناوی شتەکە (بیرۆکەی لە خۆدا تەواو - قائم- یاخود وێنەی باوی) بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەم شتە خۆی، لەخۆیدا. بۆ نموونە شاعیری خۆشەویستی بۆ "بیرەکان"ی - إمرئ ألقیس- یان ئەوانیتر.....

لەبارەی ئەڤینەوە ناگەڕێتەوە. بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ خۆشەویستی خۆی لە خۆیدا. بێگومان ئەم گەڕانەوەیە زۆر دژوارە. ئەویش لەبەر ئەوە نا، تیغکردنی ناوەکان (ئایدیای وێنەکان) و ئەوەش کە بەگونجان و هارمۆنی کەڵەکەبووە. بەڵکو لەبەر ئەوەیە لە پێشیشدا داهێنانی وێنە و فیکر و ئەندێشە بردنەوەکانیترە لەبارەی شتەکانەوە: چونکە بەواتای دووەم " ناولێنان"ی تازەیە بۆ شتەکان.

لێرەوە "واقیع" لەم زمانە وا دەڕوانێت وەکو ئەوەی بخوازێت ڕەتیبکاتەوە و "وەهم" جێگەی بگرێتەوە.

لەڕاستیدا زمانی شیعرگەرایی لەم "بۆشایی- مەرگ"یەی نێوان "ناوەکان"ی دێرینی شتەکان و "ناوەکان"ی شتەکانەوە دەست پێدەکات.

پڕبوونەوەی متمانەیی نازانێت بدوێت خۆ ئەگەر بشدوێت (ئەمەش کە پتر لە شیعر و ڕۆشنبیریماندا دەکرێت!)، زیندوویی، جەوهەریبوونی ڕاستەقینەیی لەلای ئامادە نابێت.

-٣-

کاتێک ناوی شتێک لە "زمان" دەنێم، هەژموونی دەکەم و دەبمە خاوەنی، چونکە ئیتر دەیناسم. ناسین هێزە: هێزی خاوەنداریێتی، هێزی ئەندیشەبردنەوە. بەمجۆرە ئەم شتە دەبێتە جێگای ئارەزووەکانم. ئەو شتەی کە هێشتا ناوم لێنەناوە، نایناسم. ناشزانم چلۆن لەبەرامبەریدا ڕێگە دەگرم. دەستی منی لەسەرنییە.

ناو، ناولێنراوم پێنادات، واتە زمان بەهەق ئەوشتەم ناداتێ کە ناوی لێبنێم تەنیا پاش ئەوە نەبێ کە "دەیمرێنم"، چونکە بەناوی ناولێنراو تێدەپەڕێنی.

ئاخۆ " ناوەکان"ی ئەفرێنەران کە بوونی جەستەییان مردووە تێنەپەڕێنراون؟ ئەوانە بەبوونی زهنی مردوون، بگرە " ناوەکانیان" بەهەمان شێوە "مردووە" تا ببێتە ئاماژە یان نیشانەیەک.

هەروەکو چۆن ناولێنراو " دەمرێت" پێویستە بیرۆکە یان وێنەی دروست بوو لە بارەیەوە " بمرێت"؛ بۆ ئەوەی بتوانین سەرلەنوێ بە وێنە و بە بیرۆکەیەکی تازە بیخولقێنینەوە. لە "مردن"ی شتەکانەوە ژیان دەستپێدەکاتەوە.

لە "مردن"ی فیکرەکانەوە ژیان دەستپێدەکاتەوە.



-٤-

لێرەدا ئاماژە بە دوو ئاراستە دەکەم، لەوەی کە پەیوەستە بە پەیوەندی نێوان شتەکە و ناوەکەی (وشە) کە لەوەی پێشکەشم کردووە بۆ ڕوونکردنەوەیان بەسوود دەبێت.

یەکەمیان مالارمیە نوێنەرایەتیی دەکات؛ کە دەکرێت بە "دێوانە"ی وشە ناوی بنێین.

دووەمیان یۆنگ نوێنەرایەتیی دەکات، کە دەکرێت بە " دێوانە"ی شتەکە ناوی بەرین. یەکەمیان بوونی بابەتییانەی شت یان جیهان ڕەتدەکاتەوە و جیهانێکی ئاخاوتن دادەمەزرێنی یاخود جیهانێکی خودگەرایی ئەندێشە ئامێز. دووەمیان بە پێچەوانەوە ئاخاوتن بەشتەوە دەلکێنی یان وا لەوشە و شت دەکات ببنە یەکێتییەک کە بەباتییانەی زانستی وەسفدەکرێت.

مالارمیە لە تێڕوانینەوە لە مەزەندەکردنی زمانەوانی عەرەبییەوە نزیکە، هەرچی یۆنگیشە پێناچێت دووربێت تەنیا لە ڕووکەشدا نەبێت. وادیارە لەڕووی بابەتییانەوە لە قووڵاییدا نییە تەنیا لەخودگەراییدا نەبێت. بەڵام خودگەرایی لێرەدا خودگەرایی هەڵچوون یاخود ئایدیۆلۆژی نییە کە لە دەستی هەڵدێت. لەڕاستیدا ئەو خودگەراییە دروستکەرە کە هەوڵدەدات ئاخاوتنی لەگەڵ ئەو شتەی لەسەری دەدوێت هاوجووت بکات، هەر چەندە ناتوانێت شتەکە بە تەواوی بونیادی یان بە جەوهەری ئاشکرا بکات. بەڵام ناشتوانێت ئاخاوتن و شتەکە هاوجووت بکات بەم پێیەش یۆنگ لەوپەڕی ئەوەی کە دەیکات، شتەکە بە خودگەرایی ڕووپۆشکراو بە بابەتگەرایی داگیر دەکات. ئەو شتەی ئاخاوتنی یونگ دەیڵێت، شتێکی تایبەتە بەخۆی وەکو ئەوەیە کە دەیبینی، نەک شتێکی بابەتییانە. بۆ نموونە؛ کاتێک

قەسیدەی ( زیخ)ی یۆنگ دەخوێنمەوە، زیخی بابەتگەرایی، زیخی مادده/ شتەکە ناخوێنمەوە، چونکە بە شێوەیەکی جوداواز دەیبینم، هەروەها بە شێوەیەکی جوداوازیش دەینووسم بەڵکو زیخی یۆنگ واتە خودگەراییەکەی دەخوێنمەوە. دەڵێم هەندێک جار ئاخاوتنی یۆنگ لەسەر شت وەکو گەمە وایە یان ئاخۆ گەمەیەکی نایابی خودێتی نییە؟ کەوابوو لەڕاستیدا یۆنگ بەناوی شیعرەوە ئاخاوتن بە شتەکەوە دەلکێنێ. سەرەرۆیی دەکات بۆ ئەوەی شیعر و ئەو بابەتگەراییەی کە دەیپارێزێت لەدەستبدات. بەڵام گەمەی شارەزا و رەفتار سازی، خودگەرایەتی ئارام دەکات.

٥- بەو زمانەی کە ناتەبایە بە زمانی یۆنگ لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە زمانی مالارمیە تێدەپەڕێنی و ئەو رەهەندانەی بۆ زیاد دەکات، کە مێژوو و بزۆزی واقیعی مرۆیی لە ئامێز دەگرێت و، نوێگەری شیعری عەرەبی دادەمەزرێنێت.

لەمەشدا بزووتنەوەی نوێگەری جۆرێک لەسەرەتای- روانینی و نووسین دەنوێنی. هەروەها ئەوە روون دەکاتەوە کە چۆن شیعری نوێ نا " گرووپگەرایی"یە. لە کاتێکدا شیعر لە رابردوودا یەک رێسا و فۆرم و پێودانگە گرووپگەراییەکان بە رابردوویی شیعری عەرەبی نوێ سەرەڕۆییە کە لە ساتێکدایە بە رابردوویی شیعریی دەگەیەنێت، بێ ئەوەی شێوازەکانی گوزارشتکردنی بە دەنگ روانینیەوە بچێت. هەروەها بە داهاتوویەکیش کە نازانێت چییە و چۆنە، بە هەنووکەیەکیش کە نەسرەوت و هەردەم گۆڕاوە. بەڵام دیسان لەمەدا نهێنی ریشەگەرایی و توانای  بەسەر بە دووداگەڕاندا شاردراوەیە.

شیعر لەدووی چی دەگەڕێت؟



لە دەرەوەی واقعیەت نا، چونکە وشە لەڕووی شیعرییەوە، ئامرازێک نییە و لەدەرەوەی ئایدیاڵیش نییە، لەبەرئەوەی وشە لەڕووی شیعرییەوە بایەخ پێدان نییە. شیعر، روونـاهی و وریابوونەوەیە/ رووناک کردنەوەی ئەوەی لە لادانی ئاراستەی یادەوەری گشتی تەقلید گەراییدا دەکرێت، وریابوونەوەش ناوڵێنانی شتەکانە بەناونان و بەزمانێکیتر، لە کاتێکدا کە ئەم کارە دەکات، وێنەیەکی نائاشنای جیهان پێشکەش دەکات و بۆ خۆشی وەردەچەرخێت. بەدووداگەڕانی بریتییە لە جووڵەی هەمیشەیی، کە لەبارەی جیهان و خۆیەوە، لە پانتایی نێوان وشە و شتەکان کە لە یەکیان جیا دەکاتەوە یان بەردەوامە لە جیاکردنەوەیان دەپرسێت.
(پاریس ١٩٨٧).

## زمان و راستی

١- بەڕاستی گومان دەکەم بەتوانا بیت لەوەی کە دەتەوێت بینووسێت.
- ئەگەر تۆ نەتوانیت ئەوەی بەڕاستی دەتەوێت بینووسێت، ئەوا نووسینەکانت کەڵکی چییە؟
-ڕۆشنبیری بەبێ نووسین نابێت. مرۆڤیش چییە، ئەگەر نەتوانێت توانستی جەستە و فیکری ئاشکرا بکات؟

٢- خەریکە ئەم هاوڕێیە بێدەنگم دەکات. ئیتر چۆن وەڵامی بدەمەوە یان بەرگری بکەم؟ بەتایبەتیش کە نووسین پیشەوکارمە، چییکەم ئەگەر نەنووسم؟ پاشان ئەز لە جیهاندا وەکو نووسەر و بەهێزی نووسین ئامادە و هەم. ئیدی واتای بەردەوامیم لە ژیان دا چێدەبێت، ئەگەر دابماڵرێم لەوەی کە ئامادەیی کارا دەمدۆزێتەوە و پێمدەبەخشی؟

٣- دەزانم ئەم هاوڕێیەم ئاماژە بە چەپێنراوی ناوفیکری عەرەبی و جەستەی عەرەبی دەکات. چەپێنراو بەفشاری مێژوو و کۆبوونەوە و سیاسەت و باوەڕگە و ململانێکان.. وەکو ئەوەی بێژێت ئەوەی کە لەبارەیەوە دەینووسیت و ئەوانیتریش لەبارەیەوە دەنووسن، جگە لە شتێکی سادە، نابێتە خواستی بەرەنگاریبوونەوە و کەشفکردن، کە



ڕووی دەرەوەی گشتیدا باوە. ئەمەش ڕێگە بە وتەی سانسۆری دامەزراوەیی دەدات. کە جیهانێکی دیکە هەیە، بەرفراوان و دەوڵەمەند، بەلاَم شاردراوە و پەردەپۆشکراو. توش شتێکی گرنگ ناڵێیت، ئەگەر نەچیتە ناویەوە و تیغی بکەیت و بیتەقێنیتەوە. تۆ بی ئەوە، هەر بە لەناوبردنی ڕۆشنبیری بەتەنیا بەشداری ناکەیت، بەڵکو دیسان بە لەناوبردنی زمانیش بەشداری دەکەیت.

٤- کەوابوو ئەم هاوڕێیە، هەر بەتەنیا مەسەلەی چەپێنراوی عەرەبی پێشنیاز ناکات، بەڵکو لەهەمان کاتدا مەسەلەی زمانی عەرەبیش لە پەیوەندی بەجیهان و شتەکانیەوە لەپەیوەندی بە ئەفراندنگەراییەوە پێشنیاز دەکات. بەتایبەتیش زیندوویی مرۆڤ و زمانەکەی، کە بەئاستی توانای لە دۆزینەوەی هاوجووتکردنی دۆستانەی نێوان جیهانی ناوەوە و جیهانی دەرەوە دەپێورێت، هەروەها لە سڕینەوەی سنووری نێوان گوزارشتکردن و ئەوەش کە دەیەوێت گوزارشتی لێبکات.

٥- ڕاڕەو گەلێک هەیە بۆ هەڵهاتن. مالارمیە، بۆنموونە زمانێک بەکار نابات بۆ ئەوەی زمانی لێنزیک بکاتەوە. بەڵکو بۆ ئەوەی لە دوورەوەی بیهێڵێتەوە. کەوابوو کێشە نییە: لێرەدا زمان بریتییە لە جیهان. بۆ نوێبوونەوەش لێرەدا، بریتی لە ئەتککردنی بەردەوامی وشە تاکەکانی زمان لە پێخەفی زماندا.
مالارمیە بەرگری لەخۆی دەکات و دەپرسێت: ئایا زمان دەتوانێت ڕاستی شتێک یان جیهان بگوازێتەوە؟ لەوەڵامدا دەڵێت: نەخێر، زمان ناتوانێت ڕووی دەرەوە تێپەڕێنی و ئەوەی دەشمێنێتەوە

بەدوورەپەرێزی دەمێنێتەوە و بێدەنگی دەوری دەدات. کەوابوو وەکو ئەوەی راستی لە دەرەوەی زمان شاردرابێتەوە.

٦- زانا دێرینەکانی عەرەب چی دەبێژن؟

زمان ئاوێنەیەکە و چەمک و دیاردە و شتەکان بەوردی پێچەوانە دەکاتەوە، زانایانی بەسرە دەڵێن، لەبەرئەوە پێویستە بە چەشنی فیکر خۆی جێگیر بکرێت. پێویستە بخرێتە بۆتەی ئەقل و لۆژیکەوە. بەڵام زانایانی کوفە، لە ریسا و یاسا ئەقلی و لۆژیکییەکان دەرچوون و گوتیان بە پێوانە. واتە: ریسایەکی گشتی نییە. بەڵکو هەمە چەشنی، گرنگی گەورەیی و تایبەتیی و هەڵاودێری تاکێتی هەڵدەسەنگێنی، یان ئەوەی بەریز پەڕ ناودەبرێت. لێرەوە لەلایان فۆرم و کێشە زمانەوانییەکان زیادی کرد و پێیان وابوو هەموو ئەوەی لەسەر زاری عەرەبەوە هاتووە، رەسەنە، ئەگەرچی پێشێلی لۆژیک و یاسا ئەقلییەکانی کردووە. وەکو ئەوەی بڵێین رەسەنایەتی لە ژیاندایە نەک لە رێسادا. جابر بن حیان، لە کتێبی "میزان و الحروف" دا وایدەبینی، کە زمان زادەی رێکەوتن نییە و هەروەها سیستمێکیش نییە راڤە بکات، بەڵکو لەدەروونەوە هەڵدەقوڵێت. ئەمەش پەیوەندی جەوهەری نێوان سروشتی زمان و سروشتی جەستە دەسەپێنی، کە وەکو پەیوەندی نێوان ئاواز و ژێیە.

٧- بۆ چی ئاخاوتن لەسەر چەپێنراو لە فیکر و جەستەی عەرەبیدا دەمانبات بۆ ئاخاوتن لەسەر ئاخاوتن؟ ئاخۆ ئێمە دەخوازین وێنەی وێرانەیی رۆشنبیری عەرەبی بکێشین، یاخود بە پێچەوانەوە، دەمانەوێت وزەکانی پەرەسەندن و بەپێزبوون بتەقێنینەوە؟



٨- ئەمڕۆ، پەیوەندی زمان بە شتەکانەوە پتر دەوروژێت. شوێن بەماتریاڵ و بۆشاییەوە ناکۆتاییە. کاتیش رێژەییە، بونیادی گەردیلەگەرایی ماتریاڵ، شەپۆل/ تێربوو بە وزە... هەموو ئەمانە ناتوانرێت بە وشەکان گوزارشتیان لێبکرێت. جیابوونەوەی نێوان زمان و جیهان روو لە زیادبوونە، هەروەکو ئەوەی ئەو وشانەی کە بەکاریان دەبەین بزربووبن: ئەوە رابردووە کە تەقاندنەوەکانی ئێستا بە جوڵە و وەرچەرخانەوە تێپەڕاندووە. بەڵام هاوکاتیش هێشتا تیادا بەردەوامە و لە سیستم بەندی و دامەزراوەکاندا بڵاوە.

کەوابوو نە دەربڕی ئامادەبوونی زیندووە و نە دەربڕی دردۆنگییەکانی داهاتووشمانە. بەڵکو دەربڕی وەهمی بەردەوام بوونمانە لە بووندا. بەواتایەکیتر وشەکانمان واتای نییە. بەمجۆرە دەدوێین یاخود دەنووسین بۆ ئەوەی وشەکان بدەین بە یەکتریدا یاخود بۆ ئەوەی بەرگی مردوویان لەبەر بکەین یان بۆ ئەوەی هیچ نەبێژین.

ئەمە پوختەی ئەوەیە کە جۆرج شتاینزی رەخنەگری هاوچەرخی ئینگلیزی لەدوا کتێبیدا " زمان و بێدەنگی" دەیلێت. وەکو ئەوەی بێژێت، راستی لە خۆرئاوا، لەمڕۆدا لەدەرەوەی زمانەکانی خۆرئاوایە.

٩- کاتێک عەرەبی، کە بایەخ بە قەوارەی زمان و رۆشنبیرییەکەی دەدات و دەخوێنێتەوە، ئەم جۆرە بۆچوونە پێویستە هەندێک پرسیار و بەراوردکاری لەلا دروست بکات :

أ- زمانی گەڕان بەدوای هەقیقەتدا، بە واتای وردتر، لە ئەورووپای سەردەمێکی نزیک، وەکو پێوەر بە زمانی عەرەبی، ئەم گەڕانە کاتێک

دەستی پێکرد هاوشێوەکەی لە ژیانی عەرەبیدا دەگەیشتە چلەپۆپەی کرانەوە و گەشەسەندنی.

ب- ئەگەر زمان لە ئەورووپادا پیر بووە لەسەر ئەو ئاستە، کە بەپێوەر بۆ زمانی عەرەبی منداڵە، ئەوا ئێمە چی بێژین لەبارەی زمانمانەوە کە گەڕان بۆ هەژدە سەدە تیایدا هەڵکشاوە.

ج- جوڵەی ئاشکرا کردنی ئەبستمی و بەدەستهێنانی ژیاری، بەتایبەتیش زانستی- تەکنەلۆژی، بە بەراورد بە زمانی عەرەبی، لە زمانە ئەورووپییەکاندا گشتگیرتر و زیاتر ریشەییە. ئەمەش تواناکانی بەرگریکردن لە پیربوونی بۆ فەراهەم دەکات، بەپێچەوانەی زمانی عەرەبییەوە کە ماوەی هەزار ساڵە لەڕووی ئەفراندنەوە بە دەست باری سەختی چەقبەستووییەوە دەناڵێنێت.

د- لەگەڵ ئەوەشدا، مەسەلەکە هەر لە پیربووندا نییە، چونکە سەرجەم ژیارەکان پیردەبن، بەڵکو مەسەلەکە بەلای ئێمەوە، لەوەدایە ئێمە پێچەوانەی زۆربەی گەلانی زیندووین و ئەوە رەتدەکەینەوە کە دان بەم پیربوونەدا بنێین. بگرە لەو ترسناکتر هەیە: پیربوون دەکەینە نیزامێک و لەسەری دادەمەزرێین و بە هاوپێوەرەکانی بۆ ژیان و فیکرمان بە ئێستا و داهاتووەوە دادەتاشین.

لەمەشدا جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ئێمە و ئەو گەلانە دا بەدیدەکرێت: ئەوان دان بەوەدا دەنێن ئەوەی کە لەڕابردوودا ئەفرێنراوە کار و رۆڵی کۆتایی هاتووە و تواناشی هەیە بەسەر تێپەڕاندن و تازە بوونەوەی ژیان و فیکریدا. بەڵام ئێمە دان بەوە دانانێین، کە هەر شتێک لەلایەن نەوەکانی پێشترمانەوە ئەفرێنراوە، دەشێت کۆتایی بەکار و رۆڵی بێت. یاخود دەشێت پیر بێت یاخود بمرێت. لێرەوە خۆهەڵدانی هەمیشەییمان بۆ ئامێزی رابردووە و،



بێتواناشین لە تازەکردنەوەی ژیان و فیکرمان، بگرە زۆرجار تەنانەت بێتواناشین لە پەسەندکردنی بیرۆکەی خودی تازەبوونەوە.

ه- ئەگەر ئەوە حاڵی نووسەری ئەورووپی بێت، کە خاوەنی کتێبی" زمان و بێدەنگی"وەسفی دەکات، بەوەی کە نووسەر مومارەسەی زمانێک دەکات وشکبووەتەوە، ئەوا حاڵی نووسەری عەرەبی لەبەرامبەر زمانەکەی چۆن دەبێت؟

١٠- ئەگەر بەبیرمان بێتەوە، کە لەنێوان نووسەری عەرەبی و دەربڕین تەنانەت لەبارەی رووی جیهان و ئەزموونەکەی چی روودەدات، ئەوا ئەو راستییە چۆنە، کە دەیگوازێتەوە یان ئاشکرای دەکات؟ ئاخۆ دەکرێت بگوترێت، لەم بارەدا بە راستی دەنووسێت؟

١١- رەنگە هەنووکە ئەم درێژەدانە بە ئاخاوتن لەسەر زمان، ئاماژە و واتای خۆی هەبێت. ئەم جیاکردنەوەیەی نێوان زمانی عەرەبی و جەستەکەی، بونیادی دەستەڵات، لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا رێکی دەخات و دەیسەپێنی و هاوشێوەبوونێکی توونـد لە نێوان سەرکوتکردنی دەسەڵاتگەرایی بە هەموو فۆرمە جیاجیاکانی و چەپاندنی ناوخۆیی لە دەرکەوتە سیاسییەکانی، بە جەستە و فیکر و ئاستە هەمەجۆرەکانی دادەمەزرێنی.

لەمەشدا تاکی عەرەبی وەکو هەیکەلی مرۆڤ دەردەکەوێت یاخود بەشێک لە ئامێر یان زاراوەیەکی داماڵراو دەبێت. بەم شێوە وا دەردەکەوین لەڕووی رۆشنبیرییەوە، لەسەر ئاستی سیستمی سیاسی-رۆشنبیری باو، بەتایبەتیش لەقوتابخانە و زانکۆ و

پەروەردەدا، لەڕووی ئەفراندنەوە، ئێمە بی زمانین: نانووسین، بەڵکو گۆکان (الفاظ) دەنەخشێنین، ئێمە ناپەیڤین بەڵکو دەنگ دەردەکەین.

– نووسینەکانت کەڵکیان چیە؟

– ئەوەندە بەسە، کە گەواهی بۆ خامۆش پێکراوەکان دەدات، لێکترازانی نێوان زمان و جەستە دووبارە دەکاتەوە، ئەوەندە بەسە کە لەگەڵ مەرگدا دەژی و هاوار دەکات: مردن، ئەمڕۆ، بەڵکو بە دیاریکراوی مەرگی عەرەبییە- بۆ جارێکی تریش، خۆ ئەگەر ئەم هاوارە بە دەنگ بەرزکردنەوەی ژیانیش بێت کە زاڵ نابێت، نووسینەکانت کەڵکیان چیە؟ دەزانم ئەوەی کە لەمڕۆدا لە کۆمەڵگەی عەرەبی- ئیسلامیدا بنووسێت، وەکو ئەو وایە کە کێڵگەیەک لە فەزادا بچێنی. چونکە ئەم کۆمەڵگەیە ڕێگەی پێدەدات پڕە لە "وا پێویستە"، "پێویستە لەسەرمان" ،"بیکەم"، "مەیکە"، "واپێویست دەکات"، "ناچاریت"، "دەبێت"... هتد. بەم هۆیانە شوێن بۆشاییە. لەمڕۆدا شوێن لە کۆمەڵگەدا بوونی نییە، جگە لە بۆشایی نەبێت: بۆشایی دەرئەنجامی مەحالبوونی نووسینە، بۆشاییش، دەرئەنجامی بێواتایی نووسینە. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە نووسین. من وەکو زۆرێک نالێم بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی دەنووسم. بە پێچەوانەوە دەنووسم بۆ ئەوە بۆشاییەکیتر بخولقێنم و هەستکردن بە بۆشاییەکیتر بێنمە ئاراوە. دەنووسم بۆ ئەوەی ئەو بێدەنگییە سەیرە کە پەیڤەکانی دروستکەران بەجێیان هێشتووە، دووبارە بکەمەوە. ئەوانەی ئەبجەدییەتیان بۆ ئامادەکردنی فەزای مەحاڵ تەرخانکردووە.

سوپاس بۆ "إمری القیس، طرفه، الشنفری، ذی الرّمه، أبی تمام، أبی نؤاس". سوپاس بۆ "حلاّج، أبن عربی،متنبیَّ، المعرَّی، جبران". کە لێیانەوە فێردەبم، تەنیا ئەو ماوانە ببینم کە هێشتا نەمبڕیووە، فێردەبم



کە نووسین ڕەهەندە و نووسینی زیاتر ڕەهەندیش، زیاتر نزیکە. فێردەبم کە کات، زەنگێکی هەیە و لێدانێکی بێدارکەرەوەی بگۆڕی ڕووەو ئاراستەی پتر جوان و قووڵی نییە، تەنیا لە شیعردا نەبێت. ئەم واقورمانە خولقێنەرە فێردەبم: ئایا بۆشایی بە شیعر بخولقێنم، یاخود لێیەوە، یان تیایدا یان لەسەریدا یان لەگەڵیدا؟ فێردەبم کە ئاخاو واتا بە ژیان دەبەخشێت، ناشتوانێت ئەوە بکات، ئەگەر جۆرێک نەبێت لەمەرگ.

لە هەموو ئەمەشدا، زمان دەبینمەوە کە بەتەنیا شوێنی زیندوو و، ئازاد و ناکۆتاییە. ئامادەبوونی جەربەزەیی و بێدوودڵییە. زمان بە دەستکردسازی یان ڕەتکردنەوە نابێت، هەروەها بە خۆمالیکردن یان بەندکردن یان غافڵکوژیش نابێت. (بەڵام، ئەی لەو پارادۆکسەی ئەمڕۆ، تەنانەت ئەوانەی کە خۆیان تەنیا بە ( زمانی عەرەبی) یەوە هەڵدەکێشن، ڕێگەی هاتووچۆکردنی لەنێوان شارێکی عەرەبی بۆ ئەویتر نادەن، ڕێگەی پێنادەن لەماڵی خۆیدا هاتووچۆ بکات!).

زمانیش سەر بە شمشێر و رم و هۆز و رژێم و پۆلیس و دەمانچە و بۆمبەکان نییە. سەر بە خاک و هەوا و ئاو و ڕووناکییە، سەر بە زمان و ئازادی و ئەڤینە.

زمان تیم و تایەفە و پارتەکان لە پەرلەمان و دامەزراوەکان، لە خوێندنگە و زانکۆکان، لە یانە یەکێتییەکان، لە دەزگا و چەک و سەربازەکان ڕێکناخات.

زمان لەم شوێنە عەرەبی- ئیسلامییەدا، وڵاتمە- کە بەهەموو لاکاندا، بەسەر هەموو ئاسۆکاندا، نزرگە و هاتووچۆم بەناو مێژوودا کە کۆیکردووەتەوە و لە داهاتووشدا کە کۆی دەکاتەوە، والابووە.

# پێشەکییەک بۆ ڕەخنەی نوێگەریی عەرەبی

١- جاریکیان گوتم: "پێویستە بۆ قۆناغی تازە: ڕەخنەی نوێگەریی دابمەزرێت" ( بیان الحداثە،١٩٧٩) لە:" فاتحە لنحصایات القرن"، دار العودە، بیروت ١٩٨٠) وادیارە هەنووکە ئەم گوتەیە لەهەرکاتێکی تری بەسەرچوو، زیاتر ڕاست و پێویستە. بە تایبەتیش کە کۆنسێپتی نوێگەریی بەدحاڵیبوونی زیاترە و ئاخاوتن لەسەری خەریکە دەبێتە ژاوەژاو. ئەوەش ئەو نووسینەیە کە بە "قەسیدەی پەخشان" هەڵدەستێت و خەریکە دەکەوێتە ناو میکانیزم و شوێن کەوتنگەرایی، هەروەکو کاری قەسیدەی کێشداری تەقلیدی. بەڕاستی ڕوانین لە دیاردەی دەرچوون لە کێش و سەروا وەکو ئەوە وایە بۆ خۆی نوێگەری قەد دەکات و ئەمەش ببێتە بناغەی ئەو بەدحالیبوون و ژاوەژاوە.

بەمجۆرە پێویست دەکات، لە ئاخاوتن لەمەسەلەی نوێگەری لەنووسینی عەرەبیدا، جەخت لەسەر پرەنسیپ بکەینەوە:

یەکەم، ئێمە بەرلەوەی شاعیر یاخود نووسەر بە نوێخواز وەسف بکەین، پێویستە لەوە دڵنیا بینەوە، کە بەرهەمهێنی ئاخاوتنێک نەبێت کە بە شیعر یان بە ئەدەبی بچوێنی، بەڵکو پێویستە بە ڕاستی نووسەر یان شاعیر بێت: مەبەستم لەوەیە لە نووسینی ئەدەبی- هونەریدا شارەزا بێت و ، گوزارشت لە خۆی و لە پەیوەندی بەوانیتر



و جیهانەوە بکات و، بەزمانێکی ئەدەبی- هونەریی و بە شێوازەکی تایبەت کە جیایبکاتەوە.

دووەم، ئەوەی کە ناوی لێدەنێین کلاسیک، پێویستە بە قووڵی بیناسین، هەروەها ئەوەش بزانین کە خەسڵەتی دێرینی بەزەرورەت لێکدژبوونی نییە، لەگەڵ ئەوەی بە نوێ ناودەبرێت.

سێیەم، کە تەواوکەری دووەمە. ئەوە بزانین خەسڵەتی نوێگەریی حوکمدانێک نییە بەلەپێش دانانی نوێ بەسەر کلاسیکدا، بەڵکو تەنیا وەسفێکە و ڕەنگە ئەم وەسفەش بکەوێتە سەر دەقێک کە لە هەمان کاتدا دەقێکی ئاسایی یاخود کرچ و کاڵ بێت. نوێگەریی بە دەربڕێکی تر شەقڵی جیاوازییە نەک شەقڵی بەها.

ڕەنگە وادیار بێت ئەم سی بنەمایە لەڕوانین دا بەڵگە نەویستییە. بەڵام لە واقیع و مومارەسەدا وانییە. چونکە لەلایەکەوە لە ژیانی ئەدەبیماندا لە نێوان نوێ و کلاسیکدا جەمسەرگیری هەیە، بە جۆرێک یەکەمیان هەر چۆنێک بێت، زۆرجار لەلای هەندێکیان ئاماژەیە بۆ پێشکەوتن، لە کاتێکدا لەلای هەندێکیتر واتاکانیان شتێکی پێچەوانە دەبەخشێت.

لەلایەکی تریشەوە، گەورەکردن لە بەرهەمی نووسیندا: هەموان بانگەشەی نووسینی ئەدەبی- هونەریی دەکەن، هەموان بانگەشەی ڕەخنە و هەڵسەنگاندن دەکەن. دەرئەنجامیش بریتییە لە ئاژاوە و تێکەڵاوکردن لە بەرهەمهێنانی ئاخاوتن و دەبنە هۆی یەکسانی گشت دەقەکان و بزربوونی جیاوازی نێوان باش و خراپ، نێوان دەگمەن و سواو. لەهەردوو باریش دا هەژاری ڕوانین و لاوازی ڕۆشنبیری پێچەوانە دەکەنەوە، لەوەش مەترسیدارتر: بە نەزان کردنی هەناسەدان و ڕاستی شتەکان.

٢- پێم وانییە کەسێک هەبێت کە بڵێت، رینە شار، بۆ نموونە یان سان-جون بیرس، میشو، جوف، یونگ، برتیۆن، بونفرا، دوبوشیە پتر لە هیراگلیتس یان نیچە یان هولورین یان گۆتە و رامبۆ و بۆدلێر و مالارمیە یان لوتریامون نوێگەری ترن کە تەنیا بە واتای زەمەنی نەبێت.

ئەمە ئەوەیە کە پەیوەست بە نووسینی شیعری فەرەنسی (بەمەبەست دەیڵێم، چونکە ئەم نووسینە چاووگی نوێگەرێتی یەکەمینمانە) کە بەتەواوەتی بە سەر نووسینی شیعری عەرەبیدا دەچەسپێت. أبو نؤاس، أبوتمام، المعری، النفری، پتر لە گەلگامیش یان امرئ القیس، نوێگەری تر نابن، تەنیا بە واتای زەمەنی نەبێت. هەروەها ئەلسەییاب، حاوی، الخال، عبدالصبور (بۆ ئەوەی کەس ناونەنێم تەنیا ئەوانە نەبن کە مردوون) پتر نوێگەرترنین کە ئاماژەمان پێکردن، تەنیا بە واتای زەمەنی نەبێت.

ئەمەش ئەوە روون دەکاتەوە، ئەوەی کە پەیوەستە بە خودی منەوە، ئەوەیە کاتێک دەقێک بە دەقێکی نوێ ناودەبەم. بەشێوەیەکی رەها لەپێش ئەو دەقانەوە بە هەند وەریناگرم کە لە رۆژگاردا تەمەندارن، بەڵکو بە واتایەکی تر شتێکی دییە کە چوارچێوەی زەمەنی دەق تێدەپەڕێنی بۆ چوارچێوەیەکیتر کە پەیوەستە بەو دید و بونیاد و رەهەندانەی کە لێوەی دەردەچێت.

ئەو دید و بونیاد و رەهەندانە کامانەن؟

ئەمە مەسەلەیەکە، بەڵام ئەوەی پارادۆکس و تەنیا مەسەلەشە لەلای ئەوانەی باس لە نوێگەریی دەکەن لەنووسینی عەرەبیدا زۆربەیان لە بیری دەکەن.



لەدرێژەی قسەکانماندا و ورد بوونەوە لە روونکردنەوە و دیاریکردندا حەزدەکەم لە بەراییدا ئاماژە بەوە بکەم، کاتێ من لەنوێگەری کۆمەڵگەی عەرەبی دەدوێم، ئاماژە بە زانست یان تەکنۆلۆژیا یان فەلسەفە... ناکەم بەڵکو مەبەستم تەنیا هونەر و ئەدەبەکانە. لەمەشدا بۆ خۆی هێما بە پارادۆکس و قڵشیانەکانی ناو کۆمەڵگەی عەرەبی و بەگەڕانی پێویست و پێشنیازکردنی پرسیاری زۆر تیایدا دەکات، کە ئەم پرسیارە دەهێنێتە ئاراوە: چلۆن نوێگەری ئەدەبی لە کۆمەڵگەیەکدا چێدەبێت، کە لە دروستکردنی بنچینەییدا بە تەقلید هەڵدەستێت، هەروەها لە گۆڕەپانە جۆربەجۆرە نا ئەدەبییەکانی تریشدا؟

حەزیش دەکەم، هێما بەوەبکەم کە ئێمە هەر لە سەرەتاوە هەڵەمان کردووە لەتێگەیشتن لە نوێگەریی خۆرئاوا، لە پەیوەندی ئۆرگانی بە ژیاری خۆرئاواوە کە لێمان نەڕوانیوە، بەتایبەتیش لە بنەما ئەقلانییەکانی بەڵکو والێمان روانیوە بەو وەسفەی بونیاد و پێکهاتەکانی زمانەوانییە. بینیمان دەرکەوتەکانی نوێگەری لە گۆڕەپانەکانی هونەر و ئەدەبیاتدا بێئەوەی بنەمای تیئوری و پرەنسیپە ئەقلانییە شاردراوەکانی دواوەی ببینین. لێرەشەوە ئاماژە قوڵەکانی لە نووسین و ژیاندا وەکویەک نائامادەبوون.

٣- نوێگەریی لە کۆنتێکستی عەرەبی- ئیسلامی بەدیاریکراوی و بەپێوەریش بۆ رابردوو، بەو وەسفەشی کە ئەفرێنراوە، بریتییە لە بزاڤ و واتاکانیشی زاڵن. کەوابوو لە وەرچەرخان و جیاوازییەکاندا شاردراوەیە. لەبەرئەوە ناشێت ببێتە تیئورییەک یان رێسا و یاسا

گەلێکی دیاریکراو. وەکو ئاسۆیەک وایە بەروونـاهی و رەهەندەکانی، باڵدەکێشێ بەسەر فەزای ئێستادا، بێئەوەی فەزای رابردوو بسڕێتەوە.

لەگەڵ ئەوەی بەزەرورەت لەگەڵیدا دابڕاوە، بەڵام بەزەرورەتیش بەردەوامییەتی. چونکە هەر داهێنانێک بۆ جوانی تازە لە زماندا ناشێت، ئەگەر پشت بە جوانی کۆنی خۆی نەبەستێت.

کەوابوو زمان قەوارەیە و ئەگەر لە ناوەوەیدا، لە ناوەوەی بلیمەتی و ناوەوەی ئیستاتیکا و ناوەوەی تایبەتمەندی دا نەبێت، ناکرێت تازەی بکەینەوە.

بەڕاستی ئەگەر تۆ نوێیت، ئەوا تۆ لە نێو ئەو قەوارەیەدا دەژیت- نەک لەتەنیشتیدا یان لەدەرەوەیدا یاخود لە پەراوێزیدا، واتە تۆ لە جوانی کۆندا دەژیت. لەناو ئەو هونەرییانەدا کەلەبن نایەت. هەموو ئاخاوتنێکیش لەسەر نوێگەریی پێویستە لەو چوارچێوە دەورەدراوە و هەمەکی و روئیا گشتگیرەدا بێت.

بە هەمە جۆریەکی تر دەڵێین، تازە دروستبوو ( المحدث) لە واتای بنەرەتی عەرەبیدا ئەوەیە کە "نە لە کتێب و نە لە سوننە و نە لە ئیجماعدا، ناسراوە". ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا ئایینییە، پاشان وەکو وەسفێک بەو شیعرە دەگوترا کە سەرپێچی شیعری کلاسیکی دەکرد. شیعری ناسراو ئەوەیە کە لە بارەیەوە ئیجماع ساز دەکرێت.. شیعری " سەرپێچکار" یش ئەوەیە کە بە تازە دروستبو یان لەدایکبوو ناو دەبرێت.

بەمجۆرە دەکرێت بڵێین، کە نوێگەریی شەقڵی ئەو گوتە و شتانەیە، کە پێشتر نەناسراون. بەم واتایەش بۆ هەر چاخێک نوێگەریی خۆی هەیە. لەمەشدا ئەوە روون دەبێتەوە، کە ناکرێت نوێگەریی شیعری بەو وەسفەی خەسڵەتی دیاریکراو و نەگۆڕە، دیاری بکرێت. هەروەکو



پێشتریش جەختم لێکردووەتەوە. بەواتایەکی تر بزاڤێکی مێژووگەراییە و بەم پێیەش لەوانەی پێش و پاشی خۆی جیانابێتەوە. جۆرێکە لە پچڕاندن- بەردەوامی.

٤- لەم ئاسۆیەدا، وادیارە ئاخاوتن لە دابڕانی ریشەیی و گشتگیر لەگەڵ کلتوور یان رابردوودا، ئاخاوتنێکە لەسەر بناغەی شیعری یان مەعریفی راستنابێتەوە.

ئەوە راستە من بەشەخشی باسم لە دابڕان و رەتکردنەوە کردووە- بەڵام لە سیاقێکی تری تەواو جیاوازدا، لە ئاستێکی تری تەواو نائاشنادا. لەو وتەیەشدا مەبەستم بوو بێژم کە شاعیری عەرەبی هەرچەندە مەزن بێت، لەبەرهەمیدا زمانی عەرەبی بەرجەستە ناکات- چونکە لەو بەرفراوانترە. بەوپێیەش دەڵێم، پێویستە لەسەر شاعیری تازە کە پەیوەست بێت بە زمانی دایکەوە نەک بە بەرهەمەکەیەوە.

لەبەر ئەوەی رۆڵەکان لەیەک رەحمەوە لە دایک بوون، بەڵام لە هەمووشتێکدا لێکدژن و لە زمانی رۆڵەکانیشدا نووسینەکانیان لێکدژە، ئەوا ئەو لێکدژییە بەڵگەی دەوڵەمەندییە- واتای دابڕان یان رەتکردنەوە بە هیچ جۆرێک ناگەیەنێت. ئەم دوانەش لەیەک باردا نەبێت روونادەن: خودی دایک رەتبکەینەوە، واتە ئەو زمانە رەتبکەینەوە کە پێیدەنووسین.

بەبێ ئەم هۆشیارییە، بەبێ ئەم ئابلۆقەدانە تیورییە، ئەوا نوێگەریی هونەری- ئەدەبی لە زمانی عەرەبیدا گیردەخوات، کە هەر ئەمەشە سیماکانی دەستی بە دەرکەوتن کردووە. ئەمەش ئەوە لە سەر شاعیرانی لاوەدا دەسەپێنێ، کە لە نێویاندا بەهرەی شیعریی گەورە

هەیە، لەتێگەیشتنی نوێگەریی و گرفتەکانی، ئەوەی لەپشت پێکهاتەکان و لەپشت پەخشان و کێشەوەیە، قوڵبینەوە.

پێویستە لەسەریان ئەوە بزانن، ئەوانەی کە نوێگەریی خۆرئاوایان دامەزراندووە، لەوێنەی رامبۆ و بۆدلێر و مالارمیە، کلاسیکی بوون- واتە ئەوان تەنیا بە فەزڵی پەیوەندی ئۆرگانی و قوڵیان بە کۆنەوە، نوێیان خولْقاندووە.

رەنگە هەندێکیان وەکو تۆمەتبار کردن بڵێن: شاعیرانی نوێخوازی عەرەبی فۆرمی شاعیرانی خۆرئاوا دەگوازنەوە. ئەم قسەیە بێ بنەمایە. ئەوانەی زمانی شیعری دەزانن، ئەوە دەزانن کە فۆرم وەرناگیرێت، ئەویش لەبەر هۆیەکی سادە، کە ئەویش ئەوەیە لە خۆیدا- دابڕاو نییە، وەکو فۆرمی دەفرێک یاخود وەکو فۆرمی ئامێرێک. فۆرمی قەسیدە وەکو جەستەی مرۆڤ وایە: ناخوازرێت. فۆرم هەمیشە فۆرمی جەستەیەکی دیاریکراوە، قەسیدەیەکی دیاریکراوە. پاشان پێکهاتەی زمانی عەرەبی جیاوازە، بە جیاوازی ماددەی مۆسیکی بە تایبەتی، لە پێکهاتەی زمانەکانی تر. لەبەر ئەوە خواستن یان گواستنەوەی فۆرمی قەسیدەی بیانی بۆ قەسیدەی عەرەبی روونادات تەنیا لەیەک باردا نەبێت: کە ئەمەی دواییان وەکو دروستکردنی ئامێرێکی بێگیان دروستکراوە. وەکو گوتم زمان، قەوارەیە و قبوڵی ئەوە ناکات ئەندامی نامۆی تیادا بچێنرێت، جگە لەوەی لەخۆیەوە هەڵدەقوڵێت چیتر قەبووڵی ناکات. ئەوە قەبووڵ ناکات کە لکێنراوە. لەبەر ئەوەی ئەفراندن لە میتای دێرین و نوێگەرییدایە، ئەوا دابڕان لە نێوان دێرین و نوێگەریدا روونادات لەقوولاییدا، بەڵکو لە نێوانیاندا جیاوازی هەیە. ئەم جیاوازییەش لەڕووی بەکارهێنانی رەگەزە کلاسیکییەکانە بە بەکارهێنانێکی نوێ و لەڕووی کەشی پەیوەستدارە بە چاخی-



رامیاری، رۆشنبیری و پرسەکان. لەلایەکی تریشەوە بە دید و روئیا پێکەوە. لێرەوە نابینین کە بە هەندێک دەقی نووسراو بەبێ کێش و دابڕاو لەگەڵ زمانی عەرەبی، بگرە لەگەڵ "الجور الخليليّ"ە" دا بە شیعر ناوببرێت. هەروەها دەشڵێم کە ئەو ناونانە لەگەڵ ئەو ئاماژەانەدا هەڵدەکات کەلەلای عەرەبە دێرینەکان لەبارەی توانای ناونانی پەخشان لە هەندێ باردا، بەشیعر، هاتووە. ئاماژەیەکی پرواتاتریش لەم بارەیەوە، بریتییە لە وەسفی عەرەب بۆ دەقی قورئانی بە شیعر-لەگەڵ ئەوەی بێ کێش و بێ سەروایە.

من گوتم نوێگەریی " جیاوازییە" بەڵام " ناوەرۆک"ی ئەم جیاوازییە قووڵ و بەرفراوان و ئاڵۆز دەبێتەوە، بە جۆرێک خەریکە "مێژوو" یان "رابردوو" دەشارێتەوە و، "ئێستا"ش گۆرەپانی ریش داکووتانی ئەم جیاوازییەیە. رەنگە هەر ئەم داپۆشینەش بێت پاڵ بە هەندێکەوە بنێ، کە قسە لەسەر " رەتکردنەوە" و "پچڕاندن" بکەن، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانە نهێنی ئەفراندنگەرایی و بزاڤگەرایی یەکەی نازانن. تێگەیشتن لە رووکەشی دەرەوە، مل بۆ دیدی راستەوخۆ دەدات کە ئامانج و بەرژەوەندی راستەوخۆی سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی ئاراستەی دەکات. ئەم داپۆشینە لە ئەفراندن و رەخنەدا وەکویەک دەردەکەوێت لەڕووی یەکەمەوە، دەقگەلێکی شیعری هەیە، دەقە کلاسیکییەکان دەشارێتەوە. بەو پێیەی پێکهاتەگەلێکی دامەزراوە کە بە کورتکراوە ناودەبرێت بەسەرپێکهاتە دامەزراوە هەمەجۆرە چەسپیوەکانی ناو یادەوەری و چێژتن و روانین. واشدیارە ئەم ئامادەییە وەکو ئەوەیە کە ئامادەیی دەقە دێرینەکان وەدەرنێت لە کایەی یادەوەری و چێژتندا، کەبەمەش بەها و چەمکە چەسپیوەکان دەلەقێنێ.

لەڕووی دووەمەوە- کەئەمەیان زیاتر ئاشکرا و راستەوخۆیە- داپۆشین لەرووکارەکاندا بەدەردەکەوێت:

أ-رەخنەگرتنی بەردەوام لە چەمکی شیعری تەقلیدیی میراتگیر. ئەویش بە دەورە دانێکی مەعریفی و پێوەرە ناباوەکانی رەخنەی باودا.

ب- هەندێک لە رەخنەگران چەمکێکی تر بۆ شیعر پێشکەش دەکەن، لەگەڵ وێناکردنی‌کی تر بۆ رۆڵەکەی، بەمەش شیعر لە " بابەت"ە تەقلیدییەکانی پەیوەستە بە ژیانی سیاسیی کۆمەڵایەتیی کلاسیک- بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەستە بە ستایش و جوێن دان و شانازی و شیوەنکردن.

ئەم بابەتانە رەوش و پەیوەندییەکان سەپاندوویانە و شیعریش ئامرازیان بووە. بەمجۆرە شیعر بۆ رەگەزە سەرەتاییەکانی دەگەڕێنرێتەوە: وشە، مۆسیک، وێنە، بۆ ئەوەی رووبەڕووبێتەوە، بە دەستپێکردنیش لەمەوە، جیهانی نوێ و گرفتەکانی، دەبێت "نوێ" دابمەزرێنرێت بۆ گوزارشتکردن لە "پرسەنوێیەکان".

ئەمەش وا دەردەکەوێت کە "رۆڵ"ی ئەوەی پێشتر شیعر دیویەتی نەهێڵێت، کە ئەویش رۆلێکی چەسپیوە لە کۆ یادەوریدا و نەهێشتنی ئەو "رۆلڕ"ەش بەلای یادەوەرییەوە، وەکو نەهێشتنی شیعر خۆیەتی.

ج- هێدی هێدی، مشت و مڕی لەمەڕ "گۆ" و (فۆڕم) و "واتا" (ناوەرۆک) پوچ بووەتەوە، چونکە جیابوونەوەی کۆنی نێوانیان لەمرۆدا واتاکەی بزرکردووە.

بەمجۆرە، لەئەمڕۆ والە قەسیدە دەڕوانرێت بەو وەسفەی یەک بونیادە و بەش بەش ناکرێت و، ئەو پاساوانەش نابینیتەوە کە لە پێودانگەراییەکانی پێشوودا هەبووە، بە شێوەی کلاسیک، بەڵکو لەخودی بونیادیدا دەیبینیتەوە. لێرەوە شیعر بێ سنوور دەبێت و



قەسیدەش سنوورێکی تری بۆ دروستدەکرێت کە نائاشنایە بە سنووردارکردنی کلاسیک. هەموو ئەمەش ئەوە بە کۆ یادەوەری رادەگەینێت کە نوێگەریی "رەتکردنەوە"ی کلاسیک و "پچڕاندن"ە لێی.

د- رەخنەگرتن ئەو جیهانە لە مرۆڤدا ئاشکرا دەکات، کە لە کۆندا نەناسراو و یان لەبیرکراو یان چەپێنراو بووە. کە ئەویش جیهانی نەستە، کە ئەم جیهانە لە یەک ئاستدا لەگەڵ جیهانی هەستدا دادەنێت و وایدەبینێ کە مرۆڤ بەو وەسفەی هەمەکییە، بەش بەش نابێت. هەروەها ئازاد بوونی هەست یان هۆشیاری ئازادبێت.

دیسان ئەمەش ئەوە بە کۆ یادەوەری بە"رەتکردنەوە" و "پچڕاندن" دادەگەیەنێت. کە دەکرێت بە دەرکەوتەکانی داپۆشین یاخود خۆپیشاندانی ئەمانە بە وەهمەکانی رەتکردنەوە یان پچڕاندن لە کلتوور لەلای تەقلیدییەکان ناو بەرین. بەهەمان شێوەی ئەو وەهمانەی کە لەلای نوێخوازەکان، نوێگەری رادەگەیەنێ، هەروەکو ئەوەی لە توێژینەوەیەکی پێشوومدا کە بڵاوکراوەتەوە باسم لێکردووە.

تێبینی ئەوە دەکەین کە پرسی سەرەکی لە نوێگەریدا هەر لە نووسینی شیعری کێشدار یان پەخشاندا خۆی نابینێتەوە. بەڵکو وایلێهاتووە لە ئاسۆی کەشفکردنی- مەعریفییدا کە ئەو نووسینە لە ناو مێژووی عەرەبی بەدەویدا دادەمەزرێنێت، خۆی دەبینێتەوە، ئەمە لەلایەکەوە. لەلای دووەمیشەوە لەدەرەوەی- مێژووی مرۆڤی هاوچەرخدا. کێشەگەرایی، نوێگەریی شیعری لە زمانی عەرەبیدا بەشێکی جەوهەرییە لە کێشەگەرایی مەعریفە- بەو وەسفەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و نەناسراوە، هەروەها لە کێشەگەرایی زانست بەو وەسفەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و سروشتە. لە کێشەگەرایی تەکنۆلۆژیاش بەو وەسفەی کار و جێبەجێکردنە. لەپاڵ ئەوەشدا لەبەر

ئەو هۆیە لە کێشەیەکی گشتگیرتر کە پەیوەستە بە بوونی عەرەب و چارەنووسی ژیارییان وەکو یەک جیانابێتەوە. لەم ئاسۆیەشدا دەبینین کە زۆربەی نووسینە باوەکانی لەمەڕ نوێگەری پێشنیازی دەکات چیتر نییە.

٧- لەمڕوانگەیەوە، نوێگەریی شیعری جگە لە بونیاد و پێکهاتەی ئاخاوتنگەرایی چیتر نییە. کە هەر لە سەرەتاوە مەعریفەی خودی شاعیری عەرەبی بەو وەسفەی خودێکە و ئەو خودەش زمان و ئەم ئامرازی ئاشکراکردن و دەرخستن و گەیاندنە، بەگریمانەیەک دائەنرێت. ئەم گەمارۆدانە مەعریفییە، مەرجی یەکەم و بەڵگەنەویستی نووسینی نوێگەرییە بۆ گوزارشتکردن لە خود، لەهەمان کاتیشدا مەرجی یەکەمی بەڵگەنەویستی پەیوەندنی خولقاندنە لەگەڵ ئەویتردا.

بەڵام ئەم مەعریفەیە لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا ئاسان نییە، بەڵکو دەڵێم، کە لە هەلومەرجی ئێستادا نیمچە دژوارە و مومارەسەکردنیش لێرەدا جۆرێکە لە نزا کە خود تێناپەڕێنێ، یاخود جۆرێکە لە سوڕانەوە و خودیش بەڕاستی ئازاد نابێت ئەگەر مەعریفە بە ئازادییەکی تەواو مومارەسەی ئاشکراکردن و دەرخستنی نەکات.

خود هەقیقەتی خۆی نانووسێت تەنیا لەمجۆرە مەعریفە ئازادەدا نەبێت، ئەمەشە ئازادیی مەعریفەگەرایی.

٨- ئەمڕۆ هەموومان لە ئاخاوتنمان لەسەر شیعر، واژەی شیعری عەرەبی نوێ بەکاردەهێنین. نوێگەریی شیعری عەرەبی بە یەقینێکی ئاشکرا دەستی لەسەر هەقیقەت و دڵنیاییە، ئیدی ئەم یەقین و دڵنیاییەی لە کوێوە دەهێنێ؟ بۆ نموونە ئەگەر پێمان بڵێت: وشەی "نوێ" و



"نوێگەریی"م لەویتری بیانییەوە خواستووە هەروەکو پەیڤ و شتگەلێکی تر.

ئەگەر گوتراوە ئەو دوو دەستەواژەیە لە مرۆدا بە بەرهەمە شیعرییەکانمانەوە لکاندوومانن، پاش ئەوەی هەمان ئەو دوو دەلالەتەمان لەو بارەیەوە وەکو ئەویتری بیانی هەڵگوت و لەژێرتیشکی هەردووکیاندا رەخنە لە بەرهەمەکانمان دەگرین و پتەویان دەکەین، ئەوا وەڵاممان چیدەبێت؟ ئاخۆ مامەڵەمان لەگەڵ ئەم دوو دەستەواژانەی دی دەیکەین، کە باش دەیانناسین. وەکو نموونەی شۆرش و دیموکراسییەت، ئازادی و سۆسیالیزم، ئەوانی تریش؟ کە لەبارەیانە کتێب دەنووسین و، فیستیڤاڵ و کۆڕیان لەبارەوە بۆ ساز دەکەین، کە لەگەڵ ئەمەشدا بوونێکی زیندوویان لە نێو کۆمەڵگەدا نییە و لە هیچ ئاستێکیشدا مومارەسە ناکات.

تەنیا بەڵکو لەسەر لاپەڕە و لە نێوان لێوەکاندا بوونیان هەیە. کە وابوو چۆن لە ئاخاوتن دا سەرەڕۆیی لەبارەی پرسێکەوە دەکەین، کە هێشتا لەبارەیەوە پرسیاری مەعریفی پێویستمان نەکردووە: ئایا بە راستی ئەوە لە شیعری عەرەبیدا بە نوێگەریی ناو دەبرێت؟ چۆن شیعرێک بە نوێ وەسف بکەین، ئەگەر بە ئاسۆی هەمەجۆری لێپرسیندا نەڕوات کە پەیڤی "نوێ" یان "نوێگەریی"بە هەردوو چەمکە ناسراوەکانیان دەکەینەوە. جا ئەوە لە ئاستی کەینونە بە بوون و نەبوونەوە یاخود لەڕووی پەیوەندی نێوان وشە و شتدا بێت یان لەڕووی دەسەڵات و هەموو جۆرە سیمبولەکانی، بەهەموو ئاستەکانیەوە بەتایبەتیش ناسیاسییەکان دا بێت. یاخود لەڕووی بونیادی تەعبیرییەوە یان لەڕووی کیشوەرێکی نیمچە پاکیزەیی لە نووسینی عەرەبیدا، کیشوەری جەستە بە رەهەند و قوڵایی و

سنوورەکانییەوە– لە ئارەزوو و خەون و هەرزەکاری و گەمە و گاڵتە و واتا و نهێنیدا، ئەمەش ئەو کیمیایەیە کەهەموو ئەمانە تیغدەکات و بە ئۆقیانووسدا بەبێ سنوور شەپۆڵ دەدات؟ کەواتە ئاخۆ نابێت لە پێشەوە لێکۆڵینەوە لەبوونی شت بکەین بەر لەوەی بەوەسف و شیکردنەوەی، یاسا دابنێین؟

٩– ئاستەمە لە بونیادی دیاری نێو کارەنووسراوەکاندا کە بە نوێ ناوی دەبەین تێبگەین، ئەگەر لە بونیادی نادیار نەگەین. ئەمەش پێویست بە دەرخستنی ئەوە دەکات کە من بە ئاڵۆزبوونی نوێگەریی لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا ناوی دەبەم. بۆ نموونە: ئاڵۆزبوون– بەدحاڵیبوون–ی هێرمینوتیکی پەیوەست بە روشنبیری سرووش و ئەوەی ژیان و بیر و ئەدەب لەسەر سرووش دەپێوێت، وەکو دیاریشە لە سرووشدا نوێبونەوە نییە، کە ئەمەش شتێکی سروشتییە. لەوانەش بەدحاڵیبوونی تایبەتمەندێتی و رەسەنایەتی و بنەچە، ئایا ئەمەی دواییینیان لە شیعری عەرەبی و ژیانی عەرەبیدا یەکدانەیە یاخود فرەیە؟ لەوانەش بەدحاڵیبوونی شوناس و چەمکی ئەویتر، یان نوێگەریی هاوتای شوناس دەبێت، ئاخۆ ئەم هاوتابوونە چۆن دەبێت؟ یاخود نوێگەریی لەیەکتر جیابوونەوەیە؟ چۆن؟ بۆ چی؟

١٠– باهەندێک بەراوردکاری لە نێوان نوێگەریی خۆرئاوا و ئەوەی ئێمە لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا بە نوێگەری ناوی دەبەین، بکەین. نوێگەری لە خۆرئاوا لە مێژوویەک لە گۆڕانکاری فەلسەفە و زانست و تەکنەلۆژیا دامەزراوە. نوێگەریی عەرەبیش لە مێژوویەک لە



هێرمینۆتیک، هێرمینۆتیکی پەیوەندی ژیان و بیر بەسرووشی ئایینی و تەواوی رابردووەوە چێبووە. لێرەشەوە ئەم جیاکارییانە بەرهەم دێن:

یەکەمیان، خۆرئاوایی– سەرەڕۆییە لە نەزانراودا، لەوەی کە هێشتا نەناسراوە، دووەمیان، عەرەبی– گەڕانەوەیە بۆ زانراو.

یەکەمیان، جەخت لەسەر من– خود دەکاتەوە، دووەمیان جەخت لە ئێمە– نەتەوە دەکاتەوە. یەکەمیان، مەرجەعیەتی نییە جگە لە ئەفراندنگەرایی نەبێت، دووەمیان لەسەر هەموو جۆرەکانی مەرجەعیەت راوەستاوە.

یەکەمیان جۆرێکە لەنزا. دووەمیان بانگدانە بۆ هۆز یان پارت یان ئایدیولۆژیا. یەکەمیان، لە جیهانێکدا دەبزوێت، پیرۆزیی و سیمبولە ئایینییەکان تیایدا باڵادەستی نییە. جیهانێکە کە تیایدا دونیایی سەرکەوتووە. دووەمیان لە جیهانێکدا دەبزوێت کە تەنیا دامەزراوە و سیمبولە ئایینییەکان نەبێت باڵادەست نین.

یەکەمیان، پرسیارکردن و گومانە، دووەمیان، یەقین و خۆبەدەستەوە دانە. یەکەمیان، کرانەوە و ناکۆتاییە، دووەمیان مەزهەبی و داخرانە. یەکەمیان، لەسەر رەهەندی رەخنەیی و بزاڤگەریی دادەمەزرێت، دووەمیان لەسەر رەهەندی پەسندکردن و ملدان چێدەبێت. یەکەمیان، تاکگەرایەتییە، دووەمیان پێکەوە بوونە.

یەکەمیان، تەقینەوەی مەعریفییە و تیایدا دیدی ئایینی فەرامۆشکراوە، دووەمیان، پەراوێزێکی بچووک لەسەرویدایە کە دیدی ئایینی کۆنترۆڵ و ئاراستەی دەکات.

یەکەمیان، ئەگەر و فرەرەهەندییە، دووەمیان، تاک رەهەند و تاک بنەما و دامەزراو و هەقیقەتی رەهایە.

یەکەمیان، لەجیهانێکدا دەبزوێت کە کۆنسێپتی خواوەند مردووە و مرۆڤ زیندووە. دووەمیان لە جیهانێکدا دەجولێت کە تیایدا مرۆڤ مردووە و خواوەندیش تەنیا و زیندووە.

یەکەمیان، لەخود و ئەوەی لەگەڵیدا دەدوێت، واقورمان و پەنهانی و گومان دەکاتە گریمانە، دووەمیان، لەخود و ئەوەی لەگەڵیدا دەدوێت جگە لەوزەی ئاشکرا و باوەڕبوون و یەقین، چیتر بە گریمانە دانانێت.

یەکەمیان، لە بەهایەکەوە دەردەچێت و هەموو بەهاکانیشی بۆ دەگەڕێتەوە، بەهایەک هەژموونی بەسەر هۆشیاری سەردەمدا کردووە و ئاراستەی دەکات، دووەمیان هەر بەتەنیا پەراوێزێک نییە، بەڵکو نابووتیشە و بە فەزڵی داقلێشانەکانی ناو کۆمولگەی عەرەبی نەبێت، ناژی. یەکەمیان، دونیاییە و، دووەمیان، ئاییینییە.

١١- وەکو ئەوەی باوە نوێگەری بە ئاشتەوانی چێنابێت، بەڵکو بە هێرش دادەمەزرێت، کەوابوو لە تیغکردنی رۆشنبیریی بەڕیشەیی و سەراپاگیری چێدەبێت. لە پاش نوێگەریی دیدێکی سەراپاگیری پرۆژەی رۆشنبیری و ژیاریی گشتگیر هەیە. کەوابوو ئەو دیدە کامەیە کە ئێمە بە نوێگەریی شیعری عەرەبی ناوی دەبەین، ئاراستەی دەکات؟ وەکو گوتم ئەو نوێگەرییەی کە دەشێت هەبێت، لە چوارچێوەی رۆشنبیرییەکی هەژموونگەردا دەبزوێت، کە خەمی یەکەمی بە ئایین کردنی دونیایە، بەڵام نۆێگەری لە واتای بەڵگەنەویستی خۆیدا دونیاییە نەک ئایینی. لەمەشدا بە گوژمێک ئاخاوتنم دەگەیەنمە ئەوپەڕ و دەڵێم نوێگەری بەو وەسفەی جوڵەیە یان بەشێکی ئۆرگانییە لە ستراکچەری رۆشنبیری عەرەبی، لەشیعری عەرەبی یاخود چێژتنی عەرەبی یاخود لە هەستیاری عەرەبیدا بوونی نییە، بەڵکو بیری عەرەبی باو وایدەبینێ،



کە نوێگەریی یاخود نوێ لەخودەوە نایەن بەڵکو لە ئەویتری بیانییەوە دێن. بەو واتایەی لە پاش وتەی بە نوێگەریی یاخود نوێ، بانگەوازی هاوردنی شتێک هەیە کە دیدی عەرەبی نەیهاوردووە. کەواتە بانگەوازێکە ئەم دیدە تۆمەتبار دەکات بەکەم و کورتی و گومان کردن لەڕاستی بوونی. بەمجۆرە لە دیاردە و کۆنسێپتێک دەدوێین کە لە کرۆکدا سیستەمی مەعریفی کە بەزمانەکەی دەنووسین و مومارەسەی بەهاکەی دەکەین و بۆ ژیان و فیکرمان دادەمەزرێنەڕوە، ئەفەروزیان دەکات. نوێگەریی و نوێ گیرۆدە بوون. پرسیاریش ئەمەیە:

بۆ چی ئەم سیستەمە ئەپستمییە لە ئاخاوتنماندا لەسەر نوێگەریی و نوێ لە بیر بکەین یان لە بیرمان بچێتەوە؟ چونکە ئەم سیستەمە بوونمان خۆیەتی.

ئاخۆ لە بیرکردنی بۆ خۆی شێوەیەک نییە لە وەهمئامێزی؟ بەمجۆرە هەموومان بەو چەشنە دەردەکەوین کە بیرکردنەوە و نووسینمان وەهم ئامێزبێت. لەبەر ئەوە ناتوانین هیچ شتێک بونیاد بنێین و بگۆڕین. وەکو ئێمە لە ئاوەز و ئامێز و چێژتن و ناو قەفەزی ئەویتردا کە بەخود ناو دەبرێت بژین.

ئاخۆ ئیتر ئێمە بەرەو هەقیقەت دەرناچین؟ ئەو هەقیقەتەی کە ئاستەنگی ئەپستمی تێدەپەڕێنێ و بە هەڵوەشاندنەوە و کۆتایی رەها و تێپەڕاندنی کارامەیە. بێ ئەو کارامەییە و چوون بەپێی خواستە فیکرییەکانی بەدیدی من نوێگەریی و فیکری نوێ لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا بگرە هەر فیکریش بە واتای وشە نابێت.

ئەوەی ئەمڕۆ بە فیکری عەرەبی ناوی دەبەین و لە خولگەی ئەم سیستەمە مەعریفییەدا دەخولێتەوە و بە گشتێتی بە گوتارگەرایی واتای کۆتایی و ئایینزاگەرایی و متمانەگەرایی بوونی هەڵدەستێ جا لە

سیاسەتدا یان رۆشنبیری و شیعردا بێت، هەروەها ئەوەش کە هەڵدەکشێ و لە شێوەی نوێژدایە و مژدەی داهاتوویەک دەدات کە رابردوو ئاراستەی دەکات و بەسەریدا بالادەستە، فیکر نییە بەڵکو جۆرێکە لە ئامۆژگاریێتی هەناسە ساردی. بەبێ ئەم هەڵوەشانەوەیە نوێگەری لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا روونادات چونکە وەکو هێمام پێکرد، نوێگەریی بە سادەترین واتای، بزاڤیکە هەڵدەستێ بە گوتنی ئەوەی کەلەم کۆمەڵگەیەدا نەگوتراوە، هەروەکو هاوشێوەی دیدی جیهانە ئازادبووەکان بۆ سەرجەم ئاستەنگە تیوری و پراکتیکییەکان. لە ئازادیی تەواوی گوزارشت و خەیاڵ بردنەوەدا کە ئەمەش بێ تێپەڕاندنی سیستمی ئەپستمی باو مەحاڵە، کە ئەویش ئەوەیە و حەزدەکەم دووبارەی بکەمەوە، بە ئایین کردنی دونیا.

ئەم خاڵانە هەر بەخەمی دیاریکردنی زاراوە ناوروژێنم، کە وردێتی لە زاراوەشدا مەسەلەیەکی پێویستە، بە تایبەتیش رەوشی فیکری و مەعریفی لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا. ئێمە لەم رووەوە جوڵەمان وەکو تەمومژ وایە، لەبەر ئەوە زۆرکات ئەو حوکمانەی دەردەچن و بەسەر ژیانی رۆشنبیریماندا باڵیان کێشاوە نادروست و وردبین نین. ئەو مەعریفە باوەی کە هەمیشە، ئەویش هێندەچانسدار نییە، چونکە مەعریفەیەکە نووقم بووە، ئەویش دیسان لە تەمومژ دەچێت. مەبەست لەورژاندنی ئەم خاڵانە، ئاماژە کردنە بەو نوێگەرییەی کە رۆژانە مومارەسەی دەکەین کە بە بەراورد بە نوێگەریی خۆرئاوا، جۆرێکە لە هەڵهاتن. ئەگەر پێویستیش بێت جۆرێکە لە خۆشاردنەوە، بەڵام ئەوەی پێویستە لە نێو شورایەکی گەورەی پڕ لە تەنگ و چەڵەمەیە و هەروەها دیسان نوێگەرییەکی بە قاچاغ براوە، بە قاچاغ بردنیشی پێویستییەکی ژیانە، بەڵێ من دەبێژم نوێگەریی لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا، نوێگەریی



رۆژە، نە لە خودەوە سەرچاوەی نەگرتووە و نە لە رۆشنبیری و بنەچەمانەوە، بەڵکو لە دەرەوەرا. پێشم وانییە بێ ئەم جۆرە خۆ بە دور گرتنانە، بتوانرێت قسە لەسەر شیعری نوێ لە کۆمەڵگەیەکی ئاوەهادا بکرێت، کە ئەم خۆ بە دوورگرتن (التحفظات) انەش لە ئاستە جۆربەجۆرەکاندا زۆر و هەمەجۆرن.

با بە روونی بڵێین، نوێگەریی ئەمڕۆ لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا، بەو وەسفەی چەمک یان تەنزیرە بە شێوە گشتییە باوەکەی، ئەوا بە تەواوی خۆرئاواییە. کاتێکیش ئێمە لەسەری دەدوێین، ئەوا ئێمە لەسەر ئەویتر قسە دەکەین و وەهمگیری ئەوەین کە ئەوی دی بریتییە لە خود. سروشتیشە کە ئەم حوکمدانە لەسەر ئاستی گشتی هەندێ لە هەڵاوێردەکان ( الاستثناءات) رەتناکاتەوە. بەڵام هەڵاوێرەکان لە نێو بونیادی کۆمەڵگەدا رەوتێکی قوڵ فۆڕمەڵەناکەن، بەو وەسفەی بەشێکی ئۆرگانییەتی. بەڵکو هەڵاوێردەکانە کە رێگە بەبوونی هەندێک لە داترازان و داقڵیشاندن لە هەیکەلی کۆمەڵگەی عەرەبی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتیدا دەدات. هەڵاوێرەکان بە پەراوێزی نەبێت لە ئەملا و ئەولا و لەسەرکەنارەکان دا ناژی. ئەم هەڵاوێرانەشە کە دەکرێت ناوی بەرین بە " نوێگەریی شاردراوە" لەبەرامبەر " نوێگەریی باو"دا.

١٢- بۆمن شیاو دەبێت کەلەم بارەیەوە ئاخاوتنم بگەیەنمە ئەوپەڕ و نوێگەری لە خۆرئاوا وەکو نۆرمێک وەربگرین، دەکرێت بگوترێت: هەر بە تەنیا نوێگەری لە ژیانی عەرەبیدا نەبوونی نییە، بەڵکو شیعریش بۆ خۆی بوونی نییە، مەبەستم بێگومان شیعرە بەو وەسفەی دیدێکی دامەزرێنەرە و کارایەکی مەعریفە لە خۆدا ئاشکراکەرە. ئێمە هەموومان دەزانین کە شیعر هەر لە سرووشەوە لە سەرجەم ئایینە

یەکتاگیرییەکاندا، بە دیدێک نەماوەتەوە بۆ دارشتنی بوون بەڵکو بووەتە وەسیلەیەک بۆ رازاندنەوەی هەبوو یان ناشرین کردنی، ئەویش بە پێی مۆراڵێتی سرووش و فۆرمەکانی.

بەم واتایە و لەم چوارچێوەیەیدا بە دیاریکراوی، دەکرێت بگوترێت و بشلێم، کە سرووش شیعرە و شیعریش هەر لە سرووشی ئاسمانییەوە مردووە. واتای مردنی شیعریش لێرەدا ئەوەیە کە چیتر بەلای کۆمەڵگەوە باوەڕ بە سرووش نەماوە، کە فۆڕمی باڵاترە و لە ڕێگەیەوە ژیان یاخود هەقیقەت خۆی پێئاشکرابکات. هەروەها ئەو فۆڕمەش نەماوە پێداویستییە پێویستەکانی پەیوەندیکردن لەگەڵ گەردوون و ئەویتردا بەدیبهێنێ. بەڵکو شیعر کۆتایی هات یاخود مرد بەو وەسفەی دامەزرێنەرە، مەسەلەکە چارەسەرنەکرا بەبێ پەرەسەندنی وەکو وەسیلەیەک لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا. بەمجۆرە ئیسلام شیعری لەسەر سنووردانا. نە لەناوەوە و نە لەدەرەوەی شاریش لە نێواندا. لەسەر ئەم سنوورەش پەڕەی سەند نەک بەو وەسفەی دامەزرێنەری مەعریفییە، بەڵکو بەو وەسفەی جوانکردن یان ناشرین کردنی بوونە، وەکو ئاماژەم پێکرد. بەمجۆرە ئیسلام شیعری پەراوێز کرد و ڕۆڵە سەرەکییەکەی گۆڕی. سەربارى ئەوەی ئیسلامی هەژموونی ئەقڵی زیاتر کرد وەکو لەوەی ژیان و جەستە بکات بەڵام دەرفەت بە شیعر درا بەردەوام بێت، ئەویش لە کەشێکی ململانێئامێزدا. ئەو کاتەی کێبڕکێی ئایینی دەکرد دوور دەخرایەوە و کاتێکیش کە دژایەتی ئایینی نەدەکرد دەهێنرایەوە. هاوکات بە پەراوێزکراوی مایەوە بۆ نەگوتن یان گوتنی راستییەکان کە رەنگە ئایین بە تەواوەتی لێیڕازی نەبووبێت. هەروەها یارمەتیدەر بوو بۆ چەسپاندنی ئەو پەڕاوێزەی گەشەی مەعریفی و کۆمەلایەتی کە عەرەب لەسەرەتای سەدەی



دووەمی کۆچی و ناوەڕاستی سەدەی پێنجەم زانیویەتی. بەمجۆرە شیعر بە رووداو و شتەوە لکا: رووداوی تێپەڕ بوو کە لە رۆژگارێتی یادەوەریدا دەتوێتەوە، شتی بەشەکی کە لە شتی نموونەدا دەتوێتەوە. شیعر بەهای نەما، تەنیا بەو وەسفەی نەبێت رابردووە یان بەبیرهێنانەوەی رابردووە.

مرۆڤ بۆ خۆشی لە دیدی ئایینی باوەوە بەهای نییە تەنیا بەو وەسفە نەبێت کە رابردووە و رۆژگاری سرووش دووبارە دەکاتەوە و لەگەڵیدا هاوتا دەبێت. بگرە لەم دیدەدا هیچ واتایەک بۆ داهاتوو نییە تەنیا بەو وەسفە نەبێت کە رابردووە. بوونی نییە بەو وەسفەی توانایەکە بۆ دروستکردنی راستی نوێ، کە نائاشنایە بە راستییەکانی رابردوو. شیعر بۆ جۆرێک لە هاوتای و ئاستەوانی و هاوکاتیش بۆ پەردەپۆشی گۆڕدرا. توانای ئاشکرا کردنی هیچی نەما وەکو ئەوەی دەبو هەبێت. بەڵکو بە پێی وتەزای باو و، کەڵەکە بوو، بە گشتێنراو کراو ئاشکرای دەکرد.

نوێگەریی یەکەم- لەم پەراوێزەدا روویدا. لەم پەراوێزی توانایەدا- زناکی یەکەمی لە توانایی شیعریدا سەرهەڵدا و خۆی بینییەوە و پرسیار بە شێوەیەکی بەردەوامیش لە خۆی و جیهان و بەهاکەی بوو. شیعر پرسیارکردن بوو لەمەڕ شیعر وەکو لەوەی پرسیارکردن بێت لەمەڕ مرۆڤ و جیهان و شتەکان. ئایا ئەمە ئەوەیە کە بە نوێبووەکانی ئێستا بەدەستیان هێناوە یان بە دەستی دەهێنن؟

شیعری زۆربەی ئەم خەڵکە بە نوێبوانە لە ئاسۆی ئەو شیعرەدا دێت کە دەکرێت بە شیعری وەزیفی ناوببرێت، کە بەشێکە لە رووداو. سەر بە رووداوە و تیایدا تواوەتەوە.

لەبەرئەوەی هۆڵدرلین دەڵێت" بە شیعر، مرۆڤ لەسەر ئەم زەمینە دەژی" دەکرێت بگوترێت " بەوەزیفی، عەرەبی لەسەر ئەم زەمینە دەژی".

١٣- دیدی خەلیلییەت- الخلیلیە- بۆ هونەری شیعر، وەرگێڕانێکی وردبوو بۆ دیدی ئایینی. لە نێوانیدا هاوجووتییەکی نیمچە تەواو هەبوو: ڕێسا و فۆڕمەکان لە شیعردا بۆ پرانسیپی ڕەها و نەگۆڕ بە تەواوەتی ملیان دا، بە هەمان بار لە ژیان و هزردا بەنیسبەت سرووشەوە. خەلیل فۆڕمێکی سەرەکی و روون و ڕەهای هاوشێوەی فۆڕمی ئایینی دانا، کە شیعری لەسەر دەپێوڕێت و شیعری لە ناشیعر پێجیا دەکرێتەوە.

لەمەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە تا وەکو ئەمڕۆ مێژووی راستەقینەی شیعری عەرەبی ئامادەیە و تاوەکو هەنووکەش نموونەی ئەم مێژووە نییە. وەکو دەشزانرێت شیعری عەرەبی کۆنترین شیعری بەردەوامە لە جیهانی نوێدا. هەروەها کۆنترۆڵی ئەم پێودانگگەراییەیە کە ڕێگەی بە ئاخاوتن لەسەر دابەزین و هەڵسانەوە لە شیعردا داوە، کە لە هەموو جیهاندا وێنەی نییە. چونکە ئاخاوتنێکە لێکدژی شیعرە و بەو شێوەیە لێیدەروانێت، کە لە زانست دەڕوانێت بەو وەسفەی چەندایەتییەکی کەڵەکەبووە یاخود والە ئایین دەڕوانێت بەو وەسفەی ڕەهەندێکە لە ئەسڵی- نموونە یان لێیەوە نزیکە.

شیعر لەسەر ئاستی مێژوویی بە دابەزین یان پێشکەوتن وەسف ناکرێت، بەڵکو بە شیعرگەرایی  یاخود ناشیعرگەرایی. بۆ نموونە لە شیعری عەرەبیدا دابەزین، پرانسیپی نوێگەری بووە بەوپێیەی تێکشکاندنی نموونەیەک و خولقاندنی زمانی ڕۆژانە بووە لە ئاستی شتەکانی ڕۆژانەدا. پاشان شیعر لە چڵەپۆپەی تەواویدا لە تەنگەژەدا



دەژی. شیعر بە دیاریکراوی تەنگەژەیە. هەردەم مشت و مڕە، ململانێی نێوان شاعیر و خۆیەتی، لەنێوان خۆی و زمانەکەیدا، لە نێوان خۆی و شتەکاندا. بەڵام شیعر بە پێی دیدی ئایینی، وەزیفەیەکە، کە بەپێی کاریگەرێتی وەزیفەگەراییەکەی پێش دەکەوێت یان دوادەکەوێت. لەدرێژەی قسەکانماندا دەڵێین شیعری عەرەبی مردووە، کت و متیش بە هۆی وەزیفەگەراییەکەیەوەیە.

لێرە و بۆ جارێکیتر دەزانین کە ئاریشەی نوێگەری، بەتەنیا گرفتی شیعر نییە، بەڵکو ئاریشەی هزر و ژیانی رۆشنبیرییە، گرفتی هزر و ئاوەزە واتای ئەوەش نوێگەری لە راستییە نوێیەکاندا بە فۆڕمی تازە خۆی ئاشکرا دەکات، دەبینێتەوە. لەبەرئەوەی فۆڕمەکان گەڕان بەدوای هەقیقەتدا کە کۆمەڵگەی عەرەبی ناسیونی سێ دانەیە: شیعر- ئایین - فەلسەفەی تواوەی ناو ئایین، ئەوا بەتەنیا هەر شیعر ماوەتەوە چۆن لە پەراوێزدا ماوەتەوە. بەڵام ئەم پەراوێزە لە چاخی ئێستای ئایدیۆلۆژیا بە هەموو جۆرەکانییەوە، رەتیکردووەتەوە. ئەمڕۆ دووبارەی بکەمەوە، کە شیعر لە کۆمەڵگەی عەرەبی بەو وەسفەی دیدێکی دامەزرێنەر یان بەو وەسفەی فۆڕمێکی ئەپستمی سەربەخۆیە بۆ روانینی بوون و ئاشکرا و گومانکردن لێی، بوونی نییە. بەم شێوەیە پێم وایە بەپشتگوێ خستنمان بۆ رەخنە، نوێگەری روونادات. خوێندنەوەی باو بۆ سرووش و مومارەسەی باو، بەشداری دەکەن لە گۆڕینی رابردوو بۆ سرووشتێکی سەیر کە لە ئەتمۆسفێرێکی ئەفسانە ئامێزی بێ سنوور دەچێت و هەموو واقیع هەڵدەلووشێت و هەژموونی دەکات و دەیجوڵێنێ، کە هەر ئەمەشە رابردوو دەمرێنێت. چونکە دووبارە کردنەوە جۆرێکیترە لە رەتکردنەوە. ئەوانەی رابردووش دووبارە دەکەنەوە، لەواقیع دا جگە لەرەتکردنەوە چیتر ناکەن.

دووبارەکردنەوەی ئەسڵەکان یاخود جووینەوەی واله مرۆڤ ناکات بە ئەسلەکانەوە – بنەچەکانەوە، گرێ بدرێت، بەڵکو رەخنە گرتن و دیالۆگ لەگەڵیدا. ئەوەی مرۆڤ رەسەن دەکات لەمەسەلەیەکی بەردەوام بە بنەچەکان دا خۆی دەبینێتەوە. بەمجۆرە ئەم مەسەلەیە رەتدەکەینەوە، وەکو ئەوەی بەبێ کلتوور و بەبێ شیعر بژین.

نوێگەریی بەزەرووڕەت جیابوونەوە و داڕمانە، لە کاتێکدا لە رێگەی مەعریفییەوە چێدەبێت و کۆ بەهایەک پێشنیاز دەکات کە نەبووە. جیابوونەوە بەشێکی ئۆرگانییە لە یەکێتی و ناکرێ سڵی لێبکەینەوە داڕمانیش روویەکی تری دامەزراندنە. نوێگەریی رەتکردنەوە و یاخی بوونی لەخۆ گرتووە، لە کاتێکدا واز لە ترادیسیۆن هێناوە، چەمکگەلی بنەچەکان و بنەما و ریشە و فۆڕمەکانیش نەگۆڕن. ئەمڕۆش ئێمەی عەرەب، نوێگەریی تایبەتمان لەسەدەی بیستەمدا ناخولقێنین، هێندەی ئەوەی کەمێک یان زۆر لە پرانسیپەکانی نوێگەری کە باو و باپیرانمان ئەوانەی لەسەدەکانی نۆیەم و دەیەمدا خولقاندوویانە و فەرامۆشکراون، دووبارە دەکەینەوە ئەم دووبارە کردنەوەیەش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە بە " نوێگەریی شاردراوە" ناوم ناوە. نوێگەریش بە جیاوازییەکانەوە بەندە، لە کاتێکدا ئەنتی ئەو چەمکگەلانەی شوناس و یەکێتی و نەگۆڕ و کۆتاییە کە باون. هەروەها جەخت لەسەر دابڕان و فرەیی و هەمەچەشنی و گۆڕان و کرانەوەی بەردەوام و ناکۆتایی دەکاتەوە.

لە کۆتاییدا دەڵێین: نوێگەریی لەسەر ئاستی دەقیی ئەفرلێزاویی یان لەسەر ئاستی تەنزیر لەدەرەوەی ئەم لێکترازانە مەعریفییە بوونی نییە. جگە لەمەش ئەوەی هەندێکیان بە نوێگەریی ناوی دەبەن جگە لە تەقلیدێکی تر نەخۆشییەکیتر لە دڵی مێژوومان دا کە نەخۆشییەکان دایڕزاندووە، چیتر نییە.



## داهاتووی شیعر/ شیعری داهاتوو

١- پرسیارکردن لە داهاتووی شیعر، رەنگە جێگەی بایەخی خوێنەر و رەخنەگر بێت وەکو لەوەی جێگەی بایەخی شاعیر بێت. وەکو ئەوەی من دەیبینم، شاعیر لەسەر خواستی بیرۆکەیەکی پێشوەخت یاخود بۆ بە دەنگەوە چوونی بانگەوازێکی دەرەکی نانووسێت بۆ ئەوەی ئەم پرسیارە سەرقاڵی بکات.

پاشان شیعر بەو وەسفەی سەرەتایە، بە زەمەن شرۆڤە ناکرێت، بەڵکو زەمەن بۆ خۆی بە شیعر شرۆڤە دەکرێت، بگرە خەریکە بڵێم شیعر زەمەنی نییە، شیعر بۆ خۆی زەمەنە.

بەو وەسفەی سەرەتاشە، وەکو ئەوە دەردەکەوێت، بەدوای جێگادا لە گەشتێکی هەمیشەییدا بێت و نیشتەجێش نابێت تا نەگات یان جێگیر نەبێت لە نەزانراودا.

لەم نەزانراوەشدا، نەگوتراو چاوەڕێی یەکێک دەکات بیدرکێنێ، ئەوەی کە نەگوتراویشە زۆر ئاڵۆز و پەنهانترە لەوەی کە گوتراوە. لەوانەشە ئەو نەزانراوە بەرفراوان بووبێت و پەنهانی و ئاڵۆزبوونیش زیادی کردبێت.

کە وابوو ئایا بڵێم کە داهاتووی شیعر، شیعر خۆیەتی یاخود شاعیران خۆیانن؟ بەڵام ئا ئەوەتا من لەمەڕ داهاتوو دەدوێم لە

کاتێکدا لە هەوڵی ئەوەدام لێی دوورەپەرێز بم. بەمجۆرە پێویستە لەسەرم یەکەمجار دان بەوەدا بنێم، کە شیعر و رابردوو، نووسین و پیرۆزیی لەسەر ئەم زەمینەی کە من ئینتیمام بۆی هەیە دووجەمەکن. زەمەنیش لەم زەمینەدا وەکو منداڵێک هەردەم لە ئامێزی ئەبەدییەتدا منجەمج دەکات و ئەم ئەبەدییەش لە دەقی نەگۆڕ و تەواو و کۆتاییدا بەهەردوو رووی تەوراتی و قورئانییەوە بەرجەستە دەبێت.

کەواتە چەند سەختە قسەکردن لەسەر شیعری داهاتوو و داهاتووی شیعر لەو زەوییەی کە من ئینتیمام بۆی هەیە، بە تایبەتیش کە لەم ئاخاوتنەوە دەگەمە ئەو زەمەنەی کە لە ئەم ئەبەدییەتەدا بەرەو هەڵوەشاندنەوە دەچێت وامەزەندە دەکرێت، ئەوەی لە بارەی شیعرەوە لە خۆرهەڵاتی عەرەبی دەگوترێت بەسەر شیعر لە خۆرئاوای ئەورووپی و ئەمریکی لە جیاوازی پلەدا نەک لە جۆردا پیادە بێت.

٢- با بۆ ئەو نەزانراوە بگەڕێمەوە، کە هەمیشە لە چاوەڕوانی شیعردایە و دەیدرکێنێ. ئەو نەزانراوە وێنەیەکی هەیە کە بە بەردەوام بە شێوەیەکی خێرا لە گۆڕاندایە و لەسەدەی داهاتووشدا ئەو خێراییە زیاتر دەبێت. لەمەزەندەدا راگەیاندن بە وەسیلە هەمە جۆرەکانی و تەکنەلۆژیا لە فۆرم و رەهەندە جۆربەجۆرەکانیدا بەرەو داگیرکردنی سیمای گەردوونی و مرۆیی دەچێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆی زیاتر و زیاتری جیابوونەوەی نێوان مرۆڤ و ئەم نەزانراوە. مەبەستم لە نێوان خۆی و خودی رۆچوویەتی. ئەو گەڕانەوەیەش بۆ ئەو دەقە رەسەنە، کە گەڕانەوەی ئایدیۆلۆژیای- سیاسییە بە پلەی یەکەم دەبێتە هاوگونجاندنی. هەروەها مرۆڤیش خۆی بە ئابڵوقە دراوی لە نێوان دوومیکانیزمدا دەبینێتەوە: میکانیزمی تەکنەلۆژیای- ماتریال و



میکانیزمی دەقگەرایی- ئایدیۆلۆژیا. ئەمەش بە شێوەیەکی گشتی رۆشنبیری و بەتایبەتیش شیعر لەخۆ دەگرێت و بۆ پێشینەیی واتا دەگەڕێتەوە، تاوەکو شیعر دەبێتە گەیشتن نەک گەڕان، بەرسڤ نەک پرسیار، نەگۆڕی نەک گۆڕدراوی.

ئیدی ئەبەدییەتیش بۆ زیاتر بەندبوونی جوڵەگەرایی زەمەن دەگەڕێتەوە بەم شێوەیە مەترسییەک چێدەبێت و هەرەشە لە شیعر و ئەفراندن بە گشتی دەکات و مەترسی ئایدیۆلۆژیاکانی دەقگەرایی تێدەپەڕێنێت کە لە سیستمە سیاسییە تۆتالیتاریستەکاندا ناسیومانە. چونکە وەکو سروشتی تەکنەلۆژی- ئایینی دەسەڵاتی خۆی لەسەرەوەڕا ناسەپێنێ، بەڵکو خەریکە دەبێتە بابەتییانە. ئەم مەترسییە سەر لەنوێ بەسەر شیعردا ئەوە دەسەپێنێ کە ببێتە وەسیلەی خزمەتکردنی ئەوەی بە هەقیقەتی ئایینی یان تەکنەلۆژی ناو دەبرێت، بەڵام بە پۆشاکێکی ترەوە بە ئایدیۆلۆژی یان سیاسی یان کۆمەڵایەتی دەگەڕێتەوە. لەمەشدا ئەوەی بەسەر شیعردا دەسەپێنرێت ئەوەیە کە زۆر لە دەقە یەکەمینییەکان هەمەجۆرتر نەبێت، هەمەجۆرییەک کە خەسڵەتی فێرکارگەرایی و ئەقڵانییەت بەسەریدا باڵادەست بێت.

ئیدی ئەو شیعرەی ئەم خەسلەتانەی تیایدا نەبێت بە وڕێنە و شێتی وەسف دەکرێت. شیعریش لەژێر فشاری ئەم دوو میکانیزمەدا پشتگیری لێدەکرێت بۆ ئەوەی لەگەڵ ئاقارێک دا هاوجووت بێت و جگە لە دەفرێکیش بۆ پاراستنی واتای ئامادە و گواستنەوەی، جگە لە رێکخستنەوەی بەردەوامی داقڵێشانەکانی رۆژگار لە پێناو ئەوەی لەگەڵ زەمەن و ئەبەدییەتی واتا و واتای ئەبەدییەتدا هاوجووت بێت، چیتر نییە.

به دیاریکراوی لەم چوارچێوەیەدا، وادیارە خۆرهەڵات و خۆرئاوا وا دەردەکەوێت ئەوە ئەوان نەبن رووەو سەدەی بیست و یەک بەرەوپێش دەچن، بەڵکو ئەوە شیعرە بەرەورووییان دەچێت و چێیان دەکات، ئیدی وادەردەکەون هەردووکیان بە ئاراستەیدا و بە جوڵەیەکی میکانیزمین رابماڵرێن، وەکو ئەوەی جۆرێک بێت لە گەڕانەوە بۆ رابردوو. ئیتر ئەو رابردووەش وادیارە لەدەقە پیرۆزەکاندا زیاتر لەهەر کاتێکی رابردوو بەرجەستەترە و لە هەناسە و فیکر و رۆژ و کارەکانیاندا هەڵگیراوە.

٣- چۆن چۆنی شیعر رووبەڕووی ئەم سووپا زەبەلاحە لە دوژمن دەبێتەوە؟

نازانم، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵدەدەم پێتان بێژم کەچی لەلای گەلاڵە دەبێت. هەروەکو ئەوەی لە ئەندێشە بردنەوە و ئەزموون دا هەڵقوڵێت و بۆ خۆشم ئەگەر لەسەدەی داهاتوودا بژیم. بەم شێوەیە ئارەزووی ئەوە دەکەم بڵێم، کە شیعر زیاتر بە نابینراوەوە پەیوەست دەبێت، بە راستییەکانی ناوخۆ – دڵەوە، رەتکردنەوەی زیاتر دەبێت بۆ هەر شتێ کە بیەوێت لەدەرەوەرا پڕی بکاتەوە یاخود لە هەر ئایدیۆلۆژیایەکدا، لەهەر سیستمێک و لە هەر دامەزراوەیەکدا دابنێت. متمانەی بەوەی زیاتر دەبێت کە خاوەنی راستییە تایبەتەکانیەتی لە هەمبەر راستییەکانی تری تەکنەلۆژیا و دەقگەراییەکاندا.

لەبەر ئەوەی راگەیاندنیش بە وەسیلە جۆر بە جۆرەکانیەوە بە هەردوو میکانیزمی تەکنەلۆژیا و دەقگەرایی- ئایینگەرایی بۆ داگیرکردنی سیمای گەردوونی و مرۆیی بە گەڕخراون، ئەوا ئامادە بوون و هەژموونگەرایی زیاد دەکات. لە بەرامبەریشدا شیعر بە وردی



لەو ناوچانە دەپرسێتەوە کە ئەو داگیرکەرە گەورەیە بێتوانایە لە چوونە ناوەوەیدا- ناوچەکانی دڵ و ئەڤین و پرسیاری سەرسامبوون و مردن. لەکاتێکدا هۆشیاری شاعیر لە بەرامبەر بەرفراوان بوونی بیاڤی بیابان زیاد دەکات ئەوا هوشیاری لەبەرامبەر ئەوەی کە شیعریش ئامانجگەراییە زیاد دەکات- بەلام بە تێگەیشتنی تەقلیدی نا، یان ئایدیۆلۆژیای سیاسی کە وا لە شیعر دەکات ببێتە وەسیلەی خزمەتکردنی باوەڕگە یان پرسێکی دەرەکی. چونکە شیعر بەو وەسفەی دەربڕینێکی بەرزترە لە مرۆڤ، ئەوا بە تەنیا پەیوەندی نێوان وشە و وشەنییە، بەڵکو بریتییە لە پەیوەندی بە جیهان و شتەکانییەوە.

لەدەستپێکەوە ئاخاوتنی شیعری ئامانجگەراییە بەو پێیەی ئاشکراکردنی ئەم پەیوەندییەیە. ئەم ئامانجگەراییەش ئەوە بەسەر شاعیردا دەسەپێنێ کە بەوپەڕی مەعریفەی زمان و، مەعریفەی مرۆڤ و جیهان و، بە قوڵترین سەر و کاریکردن و دەرخستنی بە جوانی کە بکرێت، بنووسێت. لەمەشدا بۆ شێوازەکانی دەربڕینی تازە، کە بەردەوام تازە دەبێتەوە، داهێنانی بەردەوام دەسەپێنێ.

لەم ئاسۆیەوە ئارەزووی ئەو مەزەندەیە دەکەم کە قەسیدە وەکو ئەوەی لە تەقلیدی بەجێماودا بە واتای وشە لە خۆرهەلات و خۆرئاوا ناسیومانە و بەو وەسفەش جۆرێکی ئەدەبی دیاریکراوە، ئەوا وادیارە لەبەردەم هەردوو میکانیزمی تەکنەلۆژیا و دەقگەراییدایە، وەکو ئەوەی لە دەرەوەی زەمەنی واقعیدابێت. لەبەر ئەوە کودەتایەکی تەواو لە ستراکچەری ناوخۆی و لە هەیکەلیەتی دەرەوەیدا روودەدات.

هەروەکو چۆن چەمکی شیعر و گۆڕدراو بەرفراوان بوو، بە جۆرێک کە لە بەندوباری کێش یان پەخشانی ئاخاوتن دا نەمایەوە، ئەوا پێویستە توێنەرەوەی نووسینی شیعریش بگۆڕدرێت و بەرفراوان

بێت. ڕەنگە شاعیر کاربکات بۆ ئەوەی لە نووسینی شیعرییدا ڕەگەزگەلێک کە سەر بە شانۆ و ڕۆمان و فەلسەفە و زانست و مێژوو.... بن، بباتە ژوورەوە. هەروەها ڕەگەزگەلێکی تریش لەدەرەوەی ئاخاوتن بەرێت، لە هونەرەکانیتر و واقیع و شتەکانی. لەوانەشە فۆڕمەکانی هونەر لە فۆڕمێکدا هاوکاری شیعر بکەن کە هارمۆنی لە نێوان هەموو جۆر و فۆڕمەکانی نووسین دا پێکبهێنێ. لەوانەیە لە قەسیدەی داهاتوودا شانۆ و ڕۆمان، مێژوو و فەلسەفە، شتەکان و ئەوەی لە دوایانەوەیە ترپەی دڵ و پرسیارەکانی دڵ بخوێنینەوە. ڕەنگە تیایدا نیگارێکی ئەندازەیی و موسیکس ببینین، لەوانەیە قەسیدە بووبێتە شانۆی هەمەکی بۆ هەموو زمان و شتەکان.

بەو پێیە ئارەزووی ئەو مەزەندەیە دەکەم کە لێکدژی نێوان شیعر و ئامانجە پراکتیکییەکان قووڵتر دەبێتەوە و خەریکە لەم چاخەشدا لەژێر قورساییدا دەخنکێت. ئەم دەرباز بوونەش لە دەرەوەی تەکنەلۆژیا و دەقی، ئایدیۆلۆژیا و سیاسی دەبێتە هۆی تەوەرەگیریی زیاتری دەوری خاڵی کێشکردنی ناوەوەی قولایی بوونەوەری مرۆیی. ئیدی لەو خاڵەشدا بە شێوەیەکی جوداواز شەپۆڵدانی خود و جیهان بە یەکدەگەن لە جوڵەگەراییەکی بێوێنەدا. لەبەر ئەوە مەلەکردنی شاعیر لە قولایی خۆی و ڕەهەندەکانی زمانی دا زیاتر دەبێت، ئەویش لە پێناو پرشنگی زیاتری شوناسی خودی بێژەر و شوناسی وتراودا. پێشموایە لەم ئاسۆیەدا، شیعر نابێتە نێوندکاری نێوان خوێنەر و هیچ شتێکی تر بەشێوەیەک کە بەرسڤێکی پێشکەش بکات. بە واتایەکی دی دەبێتە وزەیەک و خوێنەر بۆ خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ چوونە قوڵ و قوڵتر و پرسیار لە خۆکردن و لە جیهان و هەر لەلایەن خۆشیەوە وەڵامی تایبەتی چنگ دەکەوێت. بەواتای دووەم، لەڕووی ئەدەبییەوە دەبێتە



کڵپەیەک. ئیدی شاعیریش وەکو ئەوەی لە لوتکەیدا راوەستا بێت دەنووسێت و بیردەکاتەوە و لە هەمو لایەکەوە، هەموو شتێک دەبینێت. لە کاتێکدا شیعر ئەم کودەتایانە لە سیستمی ئاخاوتن دا ئەنجام دەدات، ئەوا دەقی شیعریش لە شێوەی ژاوەژاوێک دایە، کە تیایدا پارچەکانی جیهان و مێژوو بەیەکدا دەدەن و لە تیشکۆشدا کۆی زەمەن و شوێنەکان، دێرین و تازە، پەخشان و کێش، زانست و خەون بە یەکدەگەن و ناوەندگیری لە دەوری حەز و چێژ زیاد دەکات و تیایاندا هەڵدەقوڵێت.

قەسیدەش لەشێوەی ڕووبارێکدایە کە ڕووباری زۆری تری پیادا گوزەر دەکات و ئیدی بەو وەسفەی حەز و چێژە، تیغ کردن و ڕێگەپێدراوە و، پێکهاتەی دروستکەری بەردەوامە، کە پێکنەهاتووە و پێک نایەت و ڕەنگە تاوەکو هەنووکەش پێک نەهاتبێت، ئیدی بەم وەسفە بێت وا دیارە وەکو سەری ئۆرفیوس وایە، بەڵام ئەو ڕووبارەی کە تیایدا مەلە دەکات، دەبێتە هەموو گەردوون و لە جەستەی زماندا کۆبوونەتەوە.

٤- ئەو وتەیەی هیگل دەزانن کە دەبێژێت هونەر بووەتە مەسەلەیەک کە ئینتیمای بۆ رابردوو هەیە. دەشێت منیش بڵێم ئینتیمای بۆ داهاتوو هەیە و دوورتریش بڕۆم و بێژم داهاتووە کە ئینتیمای بۆ رابردوو هەیە، ئەو کاتەش کە شیعر تیایدا کۆتایی دێت، جگە لە مردنێکی تر چیترنییە. شیعر زەمەنی نییە، شیعر بۆخۆی زەمەنە.

## یادەوەرییەکانی
## مێژووی شیعر

مێـژووی شـیعر، لـە شـتەکانـدا یـاخود لـەو پرسـانە دا نییـە کـە گوزارشتیان لێدەکات. بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە فۆرمـەکانی گوزارشت لێکردندایە.

**١- خوێندنەوەی:**

ئایا ئەوە روویداوە کە کاتێک کتێبێک دەخوێنیتـەوە، هـەست بـەوە بکەیت، وەکو ئەوەی وشـەکانی بـەدەستەوە بگریت، -هـەندێکیان لـە دەرەوەی خۆت ریز بکەیت یاخود هـەندێکی تریـان لـە پـەنجـەرەکەوە فڕێ بدەیتە دەرەوە، یاخود لە هەندێکیان ملوانکەیەک بۆ گەردنی هەوا دروسـت بکـەیـت؟ ئـاخۆ ئـەو کاتـە پرسـیار دەکـەیـت: کـە چـی دەخوێنمەوە؟ ئایا ئەوەیە کە حەزم پێیەتی یان نا؟ ئەوەیە کە دڵتـەنگم دەکات یان ئاسوودە؟ بێهیوا بوونمە یاخود تکاکانمـە؟ ئاخۆ ئـەوەمنـە، یان من نییە؟

هەروەها دەپرسم: لە هەر دووباردا چاوەڕوانی چی لـە خوێندنـەوە دەکەیت؟ بە تایبەتیش جوانترین شت لـە وشـەکانـدا نزیکییـان کە زۆر دوورە و، دووریشیان زۆر نزیکە. ساتێکە لـە بـەردەم دیدەدا دەبـن و لە کیشوەرەکانی تریشدا دەبن.

بـەتایبـەتیش جوانترین خوێندنـەوە ئـەوەیـە کـە هـەستی ئـەوەت لا دروست دەکات، تۆ لە دارستانێکدا وێڵیت و چاودێری سـەرگـەردانی وشە دەکەیت. بەتایبەتیش کە وشـەکـان گـەروو و دەنگن: گوێڕادێرن، ئێوەن کە ئاشقی خوێندنەوەن.



**٢- خوێندنەوەی:**

کەی لە ژیانی رۆشنبیریی عەرەبیدا، خوێندنەوەیەک چێدەبێت بـەو وەسفە لە دەقی شیعری دەڕوانێت، کە کایەیەکە بۆ دایالۆگی هەست و سۆز و ئارەزوو و ئەندێشە بردنەوەکان، مەبەستم کایەیـەکە بـۆ راڤـە و، خاوەنەکەشی ئەوە دەزانێت کە ئەوە یەکێکە لە راڤە جۆربـەجۆر و شێمانەییەکان؟

ئەم پرسیارە بۆیە دەکەم، چونکە لـە ژیـانی شـیعریماندا دەقی تیا نیشتەجێبوو بە شێمانەیی و شیاو، کە تیایدا ئەفسانە و خەون و فیکر دەست لەملان دەکەن لـەگـەڵ جـەستەدا: جـەستەی مـرۆڤ و ژیـان و، جەستەی واقیع.

نموونەی ئەم دەقانەش پێویستی بەوجۆرە خوێندنەوانە هەیە:

**شادی**

شـادمان دەبێت، هـەرکاتێک دیـوارێکی لـەقـەڵای ئـەم زەمـەنـە بینی خـاپوور دەبێـت. بـەرەو رزگـارکردنی دەچێـت، مـشتی پیـادەکـات و دەیکێشێت، پاشان بە پەنجەکانی ئەیپروێنێ و دواتریش بەبای دەکات و بڵاودەبێتەوە و نامێنێت.

**واقیع**

... دەمێنێتەوە تا لـە بـارەی واقیعـەوە بنووسێت. بـەمجۆرە بـۆ لای دێت، دەستی ئەندێشە بردنەوەی گرتووە. بەمجۆرە بەدیدێت، ناتوانێت هەبێت تەنیا بۆ داهاتوو نەبێت.

**بەرگری**

ئەوەی بـەتوندی بـەرگری لە مـافی جیاوازی دەکات، پێویستە بـە توندیش بەرگری لە مافی ئینتیما بکات.

**خەون**

خەون دەبینی، هەردەم خەون دەبینی، بۆ گەیشتن بە زمانێکی نزیک بەهەشت، وەکو ئەوەی شتەکە خۆی بێت. زمانێک کە وردەکارییەکانی جیاوازی نێوان شتەکان لە ئامێز دەگرێت. وردەکاری جیاوازی نێوان شپرزەییەکانی دەروون. خەونێک دەکێشێت کە لەگەڵ هەناسەداندا بۆ بەرزترین ترۆپک هەڵدەکشێ و لەگەڵ هەناسە وەرگرتنیشدا بۆ دوورترین قوڵایی دادەکشێ... ئایا خەون بە توڕەهاتییەوە دەبینی؟

**کلاسیکییەت**

"گادامیر"، کاری کلاسیکی بە شیعر و نیگارەوە...هتد، بەوە دیاریدەکات، کە کارێکە دان بە تایبەتمەندێتی ئیستاتیکای خۆیدا دەنێت، بەو وەسفەی لەڕووی مێژووییەوە تایبەتمەندێتی دامەزراندنگەراییە. هەروەها تایبەتمەندێتی کلاسیکییەتیش ( کە هێزی دامەزراندنە- لەڕووی مێژووییەوە) لەتوانای کارکردنی هونەریدا لە مومارەسەی کارتێکردن لەسەر چێژ وەرگرتن و زمان و شاعیران و نووسەران و هونەرمەندانی نەوەی هاوچەرخ و ئەوانەی دواتر، دەردەکەوێت.

کێ لە ئەفرێنەرانی نوێخواز، لەژێر ڕۆشنایی ئەم دیاریکردنەدا ناخوازێت کە ببێتە کلاسیکی؟

**ئەنجامگیری**

توندڕەو، سەرسەخت؟

بەڵام، ئەمە بەڵگەی پووچبوونی بەڵگەکانی نییە؟

**خوازە**

باپیرانمان کۆکن لەسەر ئەوەی کە زۆرترین زمان خوازەیە. لەگەڵ ئەوەشدا لەمڕۆدا بەکەمی سەرنج لە گرنگی و دروستی ئەم گوتەیە



دەدوێت، کاتێک دەقێکی شیعریی دەخوێنینەوە بەتایبەتیش کە زمانی شیعریی بە دیاریکراوی خوازەیە.

ئێمە دەزانین کە بە خوازە وێنەی شتەکان بەرهەم دەهێنین، واشدیارە لەیەک کاتدا خۆیەتی و یەکێکی تریشە. چونکە خوازە شتێک لەخۆیدا دەردەهێنێ و دەیخاتە یەکێکی ترەوە. هەر ئەمەشە کە الجاحظ لەوتەیەکدا گوزارشتی لێدەکات: "لێکچواندن کەڵکی خۆنەویستی تێدایە نەک دیاردیگەرایی- التشبیه یفید الغیریه لا العینیه" (الحیوان:١/٩٩).

لێرەدا " سەیر و سەمەرەیی" یان "پەنهانیبوون" کە خوازە بەرهەمی دەهێنێ، خۆی دەشارێتەوە. چونکە خوازە هەمیشە ئیشکال و بەد حاڵیبوونە، هەروەها والە زمان دەکات ئەوە بێژێت کە زۆر جار نایڵێت. ئەمەش لەلای الجرجانی ئاشکرا دەبێت، کە دەڵێت: " واتای کۆگر لە هۆکاری سەیر و سەمەرەیی لەوەدایە، کەنیچە مەبەستدارە لە شتەکە، کە ئەمەش ئەندێشەی لێداناماڵێت و ناکەوێتە وەهمەوە لەکاتی یەکسەر تەماشاکردندا"، (أسرار البلاغه، ل ١٣٣).

بەواتایەکی دی دەبێژین، دەقی شیعری خوازەیە و زۆر جاریش زمان و ژیان وەکو یەک تیغ دەکات. کەوابوو ئەم دەقە بەزەروورەت پێویستی بە خوێندنەوەیەک هەیە کە دیسان خوێندنەوەی ئاسایی تیغ بکات. رەنگە بۆ تەواو کردن ئەم وتەیە دروست بێت: پەنهانی لە نووسیندا نییە، بەڵکو پەنهانی لە خوێندنەوەدایە.

**کاریگەریی**

ئەفراندن مێژوویەکی تایبەتی لەناو مێژوودا هەیە. لەو مێژووە تایبەتەدا دەبینین کە مێژوو "کوڕ"ی داهاتووە، ئەوەندەی کە داهاتوو (کوڕ)ی رابردوو بێت. چونکە شیعری " کلاسیک" کاردەکاتە سەر

شـيعرى " نـوێ"، ئـەميـشيان كـاردەكاتـە سـەر ئـەو يـان لـەڕووى كـارتێكردن لـەگـەڵيـدا و لـە خوێندنـەوەدا بـۆى، كـەواتايـەكـى دى پێدەبەخشێت – واتە "بوون"ێكيتر، كە لەڕابردوودا نەيبووە.

ئەمە مەسەلەيەكى بنچينەييە، مەبەستم كاريگەريى نوێگەرييە لەسەر كلاسيكييەكان كە رەخنەى عەرەبى بە تەواوەتى فەرامۆشى دەكات، لەگەڵ ئەوەشدا رەنگە وەكو من دەيبينم پڕ بايەختر بێت و زياتريش لە ئێستادا پێويستى بە لێكۆڵينەوە و تێڕامان بێت.

**سرووت**

سرووتى من لە شيعرى جاهليدا (پاشتريش، بە گشتى) سرووتى ژيانييە– جوانييە لە ناو جيهاندا. سرووتى من لە شيعرى سۆفيگەريدا، خەونى– نادياريية لە دەرەوەڕاى جيهان بەراستەوخۆ.

**ڕێنيسانس**

وشەى " ڕێنيسانس" مەبەست لێى چيە؟

– ئاخۆ جيابوونەوەيە لە رابردوو يان گەيشتنە پێى؟ بەڵام چلۆن جيادەبينەوە و چلۆن پێى دەگەين؟

– ئايا "ڕێنيسانس" لە كۆمەڵگەى عەرەبيدا دەستنيشان دەكرێت بە پێوەر بۆ مێژووى ئەم كۆمەڵگەيە، ياخود بە پێوەر بۆ مێژووى كۆمەڵگەيەكى دى؟ بەرابردوو يان بە ئێستا يان بە داهاتوو ديارييدەكرێت؟

– ئايا دەكرێت، ڕێنيسانس " تەقليديێك" بێت؟ خۆ ئەگەر تازەكرنەوە بێت، چلۆن دياريدەكەين و پێوەرى كامەيە؟

بەگشتى دەكارێ بێژين، ناولێنانى " شيعرى ڕێنيسانس" لەلايەك سەر بە مۆراڵ و ئايين و سياسەتە پتر لەوەى سەر بە هونەر بێت. ئەوە لەو روانينەوە دەردەچێت، كە وايدەبينێ كلاسيك شتەكانى بە



ناولێنانى كۆتايى ناوناوە و راستييەكانى بەڕستە گوتووە، لێرە و هەنووكە و بۆ هەميشەيى. هەروەها سووربوونى ئەم روانينە لەسەر دووبارە كردنەوەى گوتەى گوتراو.

كەوابوو " شيعرى ڕێنيسانس" لە كلاسيكەوە تەماشا دەكرێت و، تێدەكۆشێت بۆ گوتنى: من درێژكراوەى تۆم، هاوشێوەتم و هەوڵدەدەم لە تۆ بچم. بەڵام كاتێك شاعير نالێكچوويەك لەگەڵ كلاسيكيكدا پێشكەش ناكات، ئەوا تاكێتى و بگرە خودى زمانى شيعريى كلاسيكيش دەكوژرێت. چونكە دووبارە كردنەوەى بەرهەمى ئاخاوتنى پێشتر، بوونەوەرى قووڵ دادەپۆشێت و دەرخستنى بە وەهمگيرى دەكات. بۆ ئەوەى ئاخاوتنى شيعرى عەرەبى خوڵقێنەر بێت، پێويستە لەسەرى كە مرۆڤ و بوون ئاشكرابكات، ئەويش نەك لەڕووى ئەوەى ئاخاوتنى گوتراوە، بەڵكو لەڕووى ئەوەى كە هەردووكيان كرانەوەى بەردەوامن و قەوارەيەكن هێشتا نەگوتراون.

**لۆژيک**

لە باڵادەستى لۆژيك بەسەر ڕێزمانى عەرەبيدا لە بە ئەقلانيكردنى زمان خۆيدا پشكى نەبووە: ئەفسوون و ئەفسانەيى لێداماڵيوە، شيعرييەتى لێداماڵيوە. بگرە لە چەپاندنى جيهانى دەروونيى نالۆژيكيشدا پشكى هەبووە.

**ئەزنا ( اللاّ أنا)**

كاتێك بارى سرووشتى بۆ سرووشتى بوونى خۆى لاى مرۆڤ ناگەڕێتەوە، گەيشتن پێى دەبێتە كارێك كە پێويستى بە هەوڵدان دەبێت. هەروەها كردەش لەگەڵ هەڵچوونەكان هاوجووت نابێت. بەم شێوەيە مرۆڤ هەست بە سنوورى خۆى دەكات بەو جياوازييەى كە هەڵچوون و كردەكانى ئارەزوو و تواناكانى لێكجيادەكاتەوە.

ئەزنا- واتە ئاستەنگەکان لە هەموو جۆرێک گەورە و زۆر دەبێت. لێرە و رابردوودا دەبێتە سۆز و بیرەوەری و جێگەی شانازیکردن، چونکە وادەردەکەوێت بەتەنیا ئەو فەزای ئازادی بووە، خاڵی ژوانی نێوان هەڵچوون و کردەبووە. بەوپێیەش مرۆڤ وا هەست دەکات کە لە ئێستادا بوونی نییە، بەڵکو بوونەکەی بوون نییە تەنیا لە بیرەوەری و رابردوودا نەبێت.

**بەندوبار**

بەندوبار بریتییە لە "داڕشتنی گۆکان و پێکەوە و دانانێکی ورد لەنێوان ئەو و واتاکاندا". بەندوبار هەر بەتەنیا "شیعر" ناگرێتەوە، بەڵکو "پەخشان"یش دەگرێتەوە.

**سرووشت**

سرووشت لە سۆفیگەراییدا جەستەی نادیارییە یاخود وێناکەیەتی وێنا و واتا (خود)، یەکن، یان هەردووکیان یەکێتی بوونن هەروەکو ئیبن عەرەبی دەبێژێت. بەڵام سرووشت بە پێی هەڵوێستی ئایینی تەقلیدیی، جگە لە شوێنی نیشتەجێبوونی تێپەڕبوو بۆ مرۆڤ چیترنییە. تەنیا جەستەیەکە.

ئەم هەڵوێستە لە سرووشتدا زایەڵەی بتپەرستییە. وتنیشی رەتکردنەوەی بیرۆکەی چاودێریی خوداییە و سڕینەوەی گوناهیان هەڵەیە، چونکە سرووشت دەڵێت: هەموو شتێک حەڵاڵە. لەگەڵ ئەوەی دەروون لەلای سرووشت، فەرمانی خراپەی پێکراوە و جەستەش جێگای هێزەکانی شەڕە. لەبەر ئەوە پێویستە لغاو و تەمێی سرووشت بکرێت و بچەپێنرێت، بۆ ئەوەی خێر باڵادەست بێت. لەوانەیە ئەم هەڵوێستە لە بنەڕەتدا ئەو قسەیە بێت کە شیعر بە لەدەست دەرچوون دادەنێت لەوەی شاعیران بەرەو بە ئەقڵیبوون و دانایی و



دورکەوتنەوە لە حەزەکان و ئەندێشە بردنەوەی دوور دەبات. لەوەی کە بنەمای مۆراڵی، فۆڕمی شیعریی بێت: چونکە شیعری سرووشتی ئەوەیە هەموو ئارەزووەکان بەنادوودڵی دەڵێت: بەڵام ئەوە فریودانە و، ئاستەنگە لە بەردەم زانینی راستەقینەییدا و رەگەزی گەندەڵی و گەندەڵکردنیشە. رەنگە لەمەدا نهێنی گواستنەوەی بە ناچاریی ئەخلاقییەت بۆ کایەی شیعر بدۆزینەوە، کەئەمەش بووەتە هۆی بەناچاریکردنی ئیستاتیکا، کە لە بنەما و رێسا توندەکاندا بەرجەستە بێت.

**بۆشایی**

هەیە کە بانگەشەی ئەوە دەکات، بۆ ئەوە دەنووسێت تاوەکو بۆشاییەک پڕبکاتەوە. بەلای منەوە کە بنووسیت، بە پێچەوانەوەیە، واتە سنوورەکانی بۆشایی لە جیهانماندا بەرفراوان دەبێت کە تیایدا جگە لە: "ئاگاداربە"، "پێویستە"، " دەبێت"، "وریابە"، "سەرەڕۆبی مەکە"...هتد. کە بنووسیت بۆ ئەوەیە ئەبجەدییەت بۆ ئاشکراکردنی فەزایەکیتر تەرخان بکەین. بەم شێوەیە نەزانم زیاد دەکات. مەبەستم فێربوونمە بۆ ئەوەی ئەو ماوانە ببینم کە هێشتا نەمبڕیووە.

**زەنگ**

**کات، زەنگ.**

ئارەزووی ئەو مەزەندەیە دەکەم کە شیعری- ئەڤین زەنگەکەی جوانترە.

**دووبارەکردنەوە**

هەندێ جار دووبارەی دەکەینەوە بۆ ئەوەی گەمارۆی ئەو حاڵەتە بدەین کە یەک فۆڕمی دەربڕین لە بەینی نابات. یان دووبارەی

دەکەینەوە بۆ ئەوەی هەوڵی گرتنی ئەوە بدەین کە قوورتار دەبێت یاخود گرتنی گران دەبێت.

**دەزانم**

دەزانم-کە زمان بۆ خۆی رام دەکرێت، گۆشەگیر و زیندانی دەکرێت، دوور دەخرێتەوە و دەکوژرێت.

- زمان بۆ خۆی هۆز و نیزام و چەکەکانە.
- زمان بۆ خۆی تیم و تایەفە و پارتەکانە دەزانم، دەزانم.

**جەستە**

شیعر لەزمانی جەستە و ئەڤینێتی، کرۆکی ئەفراندنیش (تازەبوونەوە، نوێگەریی) بەم جەستە و ئەڤینەوە بەندە. بێئەوەش وشە و فۆڕمەکان وەکو کاروانەکان وان کە لەناو زماندا کۆچ دەکەن، وەکو ئەوەی لە بیاباندا کۆچ بکەن.

بڕوانن: وشەگەلێک/ قەسیدەگەلێک هەن، کە توانای جوڵەیان نییە، لەسەر دوو گۆپاڵ دەڕۆن. بخوێننەوە: وشەگەلێک/ قەسیدەگەلێک، چێیان نییە: سەماناکەن، بەڵکو دەخشێن.

**پێویستی**

ئەمڕۆ لە هەرکاتێکیتر زیاتر پێویستمان بەکۆمارێکی تر هەیە، کە کۆماری نووسینە- بایەخ بە مافەکانی ئەوانیتر دەدەین کە مافی شیعر و هونەر و فیکر و ئەدەبە.

**هەڤپەیڤین**

پێیگوتم:

- ئەمڕۆ، پاش دوو هەزار ساڵ لەکاروانی شیعری عەرەبی، شاعیری عەرەبی (شوێنێک)ی نییە لەنێوگەلەکەیدا، جگە لەنێو



دەسەڵاتێکدا جێگایەک نابینێتەوە. هەروەها ئیعتراف بە خۆی یان بە جێگاکەی ناکرێت، تەنیا بە هێزی "دەسەڵاتێک" نەبێت.

گوتم:

کەوابوو ئاخۆ مافی ئەوەی نییە، ئەوەی کە بە جاهلییەت ناو دەبرێت "بەهەشتی عەدەن" ببینێ؟ لەسەری رۆیشتم: بۆ چی گلەیی لەهاوڕێی شاعیرت، کە بۆ خۆی بە نووسینی کەوتن گلەیی لێکراوە؟

**شیعری رامیاری**

- شیعری رامیاری کامەیە؟
- ئەو شیعرە نییە کە دەروەست دەبێت یاخود بە حیزبی دەبێت بەڵکو ئەوەیە کە واقیع لە ئاسۆی ئازادیدا دووبارە چێدەکاتەوە.
- بۆ چی شتەکانی سرووشت دووبارە دەبنەوە و بە جوانی دەمێنێتەوە؟
- چونکە دووبارە بوونەوە لێرەدا دووبارە بوونەوەی بزوتنەوەی گەشە و گۆڕانکارییە، نەک بۆ شتەکان لە خۆیدا.
- ئایا فڵچەی نیگارکێش دەتوانێت گوڵێک "بگوازێتەوە"؟ ئاخۆ زمانی شاعیر دەتوانێت شەپۆل یان درەخت یان پارسایییەک "بگوازێتەوە"؟
- وەکو ئەوەی هەیە بە تەواوەتی، نەخێر.
- کەوابوو، نیگارکێش یان شاعیر هەرچەندە لە " گواستنەوە"ی سرووشتدا کارامەبێت، سەرکەوتوو نابێت.
- مەبەست چییە؟
- پێویستە لە "گواستنەوە"ی سرووشت یان واقیع رابوەستێ. چونکە ئەو گواستنەوەیە چەند وردبێت سەرکەوتوو نابێت و، دەبێتە کۆپی دووەمی کارە ئەسڵییەکە و هاوشێوەی نابێت. هونەر بریتییە لە

بەرهەمهێنانی شتێکیتر لەتەک یاخود تەواوکەری شتەکانی سرووشت دەبێت. هونەر ئەوەیە کە زیادی بکەین: دروست بکەین یان بخولقێنین، لاسایی جوڵەی خولقێنەری ناوەوەی ناو سرووشت بکەین نەک شتە دروست کراوەکانی.

– ئاخۆ لەم کۆنتێکستەدا ناکرێت واتایەکی پۆزەتیڤ لە ئاستی ئەفراندن دا.

لە هەڵوێستی ئیسلام بۆ وێنە ببینین؟

**ئاو**

ئاو ئاماژەیە بۆ ژیانی پێشتر لەسەر شێوەی ئەو ژیانەی کە هێشتا شێوەکەی یەکینەگرتووە. ئاماژەشە بۆ ئەوەی روودەدات و هەمیشە فیچقەدەکات: بۆ بوون گۆڕان، بۆ گۆڕدراو و وەرچەرخاو، ئاماژەیە بۆ بەپیتی و پەرەسەندن. ئاو رەگەزێکی دروستکەرە و ئاووگی خۆراکە بۆ مرۆڤ، ئاماژەشە بۆ جەستەی سۆفیگەرایی و خولقاندن و ئەوەی کە نامرێت.

هەروەها ئاو سیمبولی مێینەیە، لەمەشدا سیمبولی ئاگر دەگات. چونکە کڵپە سیمبولی نێرینەیە. هاوکات سیمبولی خۆراکی مێینەیە و سیمبولی ئەڤین و بەهاوسەری بوون و روونێتییە. ئاگر سووتێنەر و پاکەرەوەشە.

توخمەکان دەسووتێنێت و دیسانەوە پێکیان دەهێنێتەوە. ئاو و ئاگر لەسەرەتا و کۆتاییدا ئاوێزان دەبن: ئاو بە پاکبوونەوە روون و کریستاڵی دەبێت، ئاگریش بۆ رووناهی دەگۆڕێت.

**ستراکچەر**

سێگۆشە، چوارگۆشە، ئاماژەی ناکۆتایی، پشکەکان، پیتە تاکەکانە... لە "تاکدا بە شێوگی کۆ"، هەموو ئەمانە درێژکراوەی وشەکانن، یاخود



وشەکان لە جۆرێکیتر، یاخود نەخشاندنە و هەندێ رەهەندی هەستیاری بە وشەکان دەبەخشێت، هاوکات ئاماژەشە بۆ ئەوەی کە وشە ناتوانێت وەریبگرێت یان بیداتەوە.

ئەمەیە کە دەکرێت دیسان لەبارەی سپێتی یان بۆشاییەکان لەلاپەڕەدا بگوترێت، تەنانەت ریزبەندی دێرەکانیش لەم کایەیەدا رۆڵی خۆی دەگێرێت. هەروەها بۆ بەکارهێنانی هەندێ لە پیتەکان بەهای دەنگی خۆی هەیە، کە لە وشەیەک یان لەدوو وشەدا دەستەبەرنین. هەندی جاریش تیایدا بانگهێشتێکی ئەفسووناوی و سیمبولی هەیە کە خەسڵەتی پیتەکان بەرهەمی دەهێنن.

هەموو ئەمانەش یارمەتیدەرن بۆ چەسپاندنی ستراکچەری نووسینگەرایی، بەواتای نوێ، لەبەرامبەر ستراکچەری سەرزارەکی دەق، کە ستراکچەرێکی میراتگیر و هێشتا بە شێوەکی گشتی باوە.

## یادەوەری

١- کانت دەلێت: مایەی پێکەنینە لە لۆژیک بپرسین "هەقیقەت چییە؟" و چاوەڕوانی بەرسڤ بین، هەروەها دەڵێ: ئەو کەسەی ئەم پرسیارە بکات وەکو ئەو کەسەیە بزنێک بدۆشێت و لە پەناشیدا کەسێکیتر هەیە، بێژەنگێکی بەدەستەوەیە بۆ ئەوەی شیرەکەی بەرێت.

بۆ جارێکش لە هەلومەرجی عەرەبی تێڕانەماوم، ئەگەر ئەم وتەیە بەبیر خۆم نەیهێنمەوە، هەروەکو ئەوەی ئەم بەبیرهێنانەوەیە هەردەم پەیوەست بێت بە بیرهێنانەوەی ئەوەی کە کانت دیسان دەیڵێت، فۆڕمی یاسای ئەخلاقی لە کرۆکی ئیرادەدا بەدەرناکەوێت بەڵکو لە فۆڕمەکەیدایە. واتایەکی تر لەوەدا بەدەر ناکەوێت کە ئێمە دەیخوازین، بەڵکو لەو چۆنایەتییەدایە کە ئێمە لێمان دەوێت.

چۆنایەتی: ئەمە هەر بەتەنیا بەلای ئاکارەوە مەسەلەیەک نییە، بەڵکو دیسان بەلای کار و مەعریفەشەوە. چونکە فۆڕمی کار و هزری دروست لە بابەتەکانیاندا یان لە ئامانجەکانیاندا بەدەر ناکەوێت، بەڵکو لە شێوازەکانیاندایە.

ئـ- خوێندن، بۆ نموونە: ئێمە لەبارەیەوە زۆر دەدوێین، بەتایبەتیش لە تازەکردنەوەیدا. بەڵام هەمیشە ئەوە لە بیر دەکەین کە تازەکردنەوەی خوێندن لە زیاد کردنی بابەتە تازەکاندا نییە، بەڵکو لەو شێوازەدا دەبێت کە ئێمە مومارەسەی خوێندنی پێدەکەین. دۆگمایی و سەرکوتکردن لە خوێندندا، لەو مەعریفەیەدا نییە کە دەیگوازێتەوە، هێندەی لە شێوازی گواستنەوەکەدایە.



ب- ئەو شێوازە کامەیە کە لەمرۆدا لە بواری خوێندندا مومارەسەی دەکەین؟ ئەوەیە کە هەوڵدەدات زهنی فێرخواز بە "بیرەکان" پڕبکات، بەڵام بێئەوەی فێری بکەین کە چۆن بیردەکاتەوە. ئەمەش کەشکۆلێکی لێدەخولقێنێت، نەک ئەقل و بۆ بیرەوەری دەگۆڕێت، واتە وزەی کرانەوە و ئازادیی تیادا دەخنکێنێت.

خوێندنی باو لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا، بیرەوەرییە نەک توێژینەوە بیرەوەریش هێزی ژیان نییە وەکو ئەوەی کە نەوەکانمان فێردەبن. بە پێچەوانەوە لەبیرچوونەوە، هێزی ژیانە. بەڕاستی ئەگەر مرۆڤ فێربێت، دەبێت بە بەردەوامی ئەوەی لەبیربچێتەوە کە فێربووە. "ئەوەی فێری بوویت لە بیری بکە"، النفرّي، بەم قسەیە ئامۆژگاری ئەو مرۆڤە دەکات کە دەیەوێت واقیع و ئەوەی هەیە تێپەڕێنێ بۆ ئەوەی پێویست هەبێت.

ج- "لۆژیک"ی بیروەری کامەیە، لەوەی کە پەیوەستە بە خوێندنی باو لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا؟ ئەو لۆژیکەیە کە جەخت لەسەر کرۆکی ئەم خوێندنە دەکاتەوە:

١- ئەپستمی (مەعریفە) کە پێشتر هەبوو.

٢- دێرینترینیان پتر ئەپستمییە.

٣- نزیکتر لە دێرینترینەوە، پتر لە ئەپستمییەوە نزیکە.

٤- داواکراو زانینی شت نییە، بەڵکو داواکراو زانینی ئەوەیە کە گوتراوە یان لەبارەیەوە دەگوترێت.

٥- بە بەڵگە کردنی ئەم ئەپستمییە بەبۆچوونی تازە نابێت. بەڵکو بە گواستنەوەی باوەڕپێکراویی و دروستکردنی هەموو شتێک، زانستیشمان لەسەر گواستنەوە بونیاد بنێین و دروست بکەین، کە ئەویش ئەوەیە، ئەوەی تێپەڕیووە بیزانین. چونکە خوێندنی باو لە

کۆمەڵگەی عەرەبیدا بریتییە لە گواستنەوە. بەڵام زانینی ئەوەی تێپەڕیووە بریتییە لە، زانینی خۆڵەمێش و تەم و مژ. ئەمەش ئەوکارەیە کە بەشێوەیەکی سیستماتیکی ئەپستمی لەناودەبات.

٣- ئێمە لەڕووی رۆشنبیرییەوە لە حەزرەتی بیرەوەریدا دەژین. بیرەوەری ئەزبەر دەکرێت و دووبارە دەکرێتەوە بەڵام رەخنەی لێناگیرێت، هیچ زانستێکیش بەبێ رەخنە بوونی نییە.

لەبارەی ئاخاوتن لەسەر شەوقی و شیعرەکانی، قوتابییەکی زانکۆ پێیگوتم، مافی ئەوەمان نییە رەخنە لە شەوقی بگرین. خۆ ئەگەر شەوقی ( کە جگە لە بەندوبار شیعری نییە) لەسەرو رەخنەوەیە، ئیتر چی بڵێین لەبارەی شاعیرە کلاسیکییەکانمان؟

بەمجۆرە بیرەوەری لە ژیانی ئەم قوتابییەدا بۆ چێژی سەرکوتکەریی و فاشیزم دەگۆڕێت. فاشیزم دەبێتە دڵ و زار و دەستی. بەم شێوەیە ملدانی کوێرانە لە ژیانی ئەم قوتابییەدا و زۆرێکیش لە نموونەکانی ئەم قوتابییە بۆ ستەمکاریی کوێرانە- لەناخی خۆیدا، لەهەمان ساتەوەختدا دەگۆڕێت.

٤- نموونەی ئەم قوتابییە پێت دەڵێت: شیعری شەوقی بەسوودە، شیعر پێش هەموو شتێک پێویستە بەسوود بێت. مەبەستیشی ئەوەیە کە بابەتێکی بەسوود بەرباس بخات یان خزمەتی ئامانجی بەسوود بکات.

شیعر "ماتریال"، "ناوەرۆک"ە، نەک چۆنایەتی نان بکە: گرنگ ئەوەیە نان بەرهەم بهێنێ: ئیتر چۆن کولێرەکە بەرهەم دێت گرنگ نییە. بەم شێوەیە هەندێ جار دەگەیتە ئەوەی خۆڵەمێش و توێکڵ و خۆڵ بخۆیت و ناچاریشیت دان بەوە دا بنێت و باوەڕی پێبکەیت کە ئەوەی دەیخۆیت نانێکی ئێکجار بەلەزەتە.



٥- هەرچی لەبارەی "سوود"ی شیعریشەوەیە، ئەوەیە کە شیعری بەسوود لەبەر ئەوە نییە خزمەتی ئامانجێکی بەسوود دەکات، بەڵکو لەبەر ئەوەیە چالاکییەکی مرۆیی خوڵقێنەرە. لە سرووشتی خۆیدا بەسوودە و، بەسوودنییە لەوەی کە دروستی دەکات.

ئاشق یان برسی یان یاخی بوو لەپێناو ئیشقدا یان لەپێناو برسێتیدا یان لەپێناو یاخیبووندا نانووسێت، بەڵکو شیعرەکەی درێژکراوەی ئیشق یان برسێتی یان یاخیبوونەکەیەتی، یان فۆڕمێکیتری ئیشق و برسیتی و یاخی بوونە.

٦- .... لەبەر ئەوە مرۆڤ هەر بەتەنیا کارنییە، بەڵکو دیسان گەمەشە. ئامێری هەژمارکردن نییە بەتەنیا، بەلکو دیسان سەما و گۆرانیشە. هەر بەتەنیا ئەقڵ نییە. بەڵکو دیسان ئەڤین و خونیشە. لەمەشدا کێشکردنی نووسین بە دەردەکەوێت- لەم هەرەمەکییە خوڵقێنەرەدا، لە دووبارە چاوپیاخشاندنەوەی بەردەوامدا. جا بۆ ئەوەی بە بەردەوامی مێژوو بنووسین، پێویستە بە بەردەوامی بیسڕینەوە.

## ستایشکردن بە شیعر

١- کە لە شاعیرێک یان هونەرمەندێکی عەرەبی دەپرسیت: چ کارەیت؟ لەوەڵامدا دەڵێت: فەرمانبەری دەوڵەتم یاخود مومارەسەی کارێکی ئازاد دەکەم یان لەم دامەزراوەیە یان لەویاندا کاردەکەم. یاخود هەرکارناکەم . هەروەها دەڵێت: هەمووکاتی خۆم لە بژێوی ژیاندا تەرخان کردووە.

بەنێوگێژاوی ژیانی ڕۆژانەدا خوار بووەتەوە و کەوتووەتە نێوان بەرداشەکەیەوە، کە هەستی پێناکات، تا ئەو بەرسڤە بداتەوە کە لە نەستیدا دەیژێنێت: ئەفراندنی جیهانێکی تازە بکە، ژیانی گەلەکەم وەکو ئەوەی وێنای دەکەم لەریتمی گۆڕانکاریی گەردوونیدا دابێ.

٢- شاعیر یاخود هونەرمەندی عەرەبی لە قۆناغێکی مێژووییدا دەژی کەتیایدا هەموو شتێک بۆ جۆرێک لە "هونەر" دەگۆڕێت تاوەکو هونەر ڕەتبکاتەوە کاتێکیش بارودۆخی ئەمڕۆی ئەفراندن لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا بە بارودۆخی کۆمەڵگەکانی تر بەراوردی دەکەین، بگرە بە هەندێک لە قۆناغەکانی مێژووی ڕابردووشمان کە تیایدابووە دەبینین کە هەموو وێنەیەکی تاکێتی عەرەبی دەمرێت، کە هەر ئەم وێنەیەش لایەنێکی دەوڵەمەند و جوان لە کەسێکی عەرەبی فۆڕمەڵە دەکات. ڕەنگە لەمەشدا ئەوە شرۆڤە بکات، کە ئێمە هێشتا ڕۆشنبیرییەکدا دەژین لە پاشمانەوەدێت، لە کاتێکدا پێشتر لە هەندێ لە قۆناغەکانی مێژوومان‌دا لەبەردەممانەوە دەڕۆیشت. ڕۆشنبیری زیندوو ئەوەیە کە داهاتوو و، بوون گۆڕان- الصیرورە- ئاراستەی دەکات و لە کاروانی گەل و خواستەکانی دا لەبەردەمیدایە نەک لە دواوەی. ئەفراندیش کرۆکی ئەم ڕۆشنبیرییەیە.



٣- پاش ئەمە هەندێکمان سەرسام دەکات، کە بۆ چی لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا کاری ئەفراندنگەرایی مەزن لە دایک نابێت. هەندێکی تریشمان واقیوورِ دەمێنێ کە بۆچی کۆمەڵگەی عەرەبی لەوەدا هەژارە کەبە مۆراڵێتی ئیستاتیکا ناوی دەبەین. مەبەستم لە مۆراڵەکە ژیان لە ئاستی کۆمەلایەتی و لە ئاستی شەخسی دا نوێدەکاتەوە، بەو پێیەی کە بە بەردەوامی جەخت لەسەر ئارەزووی گۆڕانکاری و ئەفراندن دەکاتەوە. بەڵکو مۆراڵ بریتییە لە حەزە جوانە مەزنەکان. هەروەها ئەم مۆراڵێتی ئیستاتیکایەشە، کە وا لەهەر تاکێک دەکات، لە کایەی کارکردنیدا هونەرمەند بێت و وایلێبکات شاعیر بێت. نەبوونی ئەم مۆراڵێتییەش وا لە مرۆڤ دەکات چێژی کارکردن و خۆشی پێدانی تەواوکردن و دڵسۆزی بۆی بزر بکات. هەموومان دەزانین کە هەر پیشەیەک باش بوون و گۆڕینی بۆ بەهایەکی کارا پەیوەستە بە خۆش ویستنی خاوەنەکەی بۆ ئەو پیشەیە. ئەو مرۆڤەش کە کارەکەی خۆش نەوێت، واتە لەڕووی هونەرییەوە پراکسیسی نەکات، هەست بەوە ناکات کە لە کاتی کارەکەیدا ئەفراندن دەکات. ئەوەی لە کاتی کارکردنیشدا ئەفراندنی نەبێت لە ئاستی شت و لە ئاستی ئامێردا دەژی: خۆی و کارەکەی لە کیس دەچێت. کە وابوو ئەم مۆراڵێتییەیە کە جەخت لەوە دەکاتەوە کە پێویستە مرۆڤ لە خودی خۆیدا و پاشانیش لە کارەکەیدا ئەفراندن بکات. چونکە خودی هەریەکێک لە ئێمە، وەک هەمان جیهانی دەرەکی بۆ ئەوەی بە بەردەوامی بەدیبهێنین، کارێکە تەواو نابێت: پرۆژەیەکی والایە بەڕووی ناکۆتاییدا. لە بەر ئەوەی کارکردن ژیان بۆ باشتر دەگۆڕێت ئەوا هونەریش وامان لێدەکات کە لەم ژیانەدا بە شێوەیەکی قووڵتر و جوانتر بژین. ئەوە مۆراڵێتی ئیستاتیکاشە کە فێرمان دەکات چۆن پراکسیسی ئەم ژیانە

بکەین. بەمجۆرە دەبینین کە کۆمەڵگەکەمان بە بەردەوامی لە ئاستی ئەفراندن دا دەژی و، بگرە کۆمەڵگەیەکیش دەبێت پیریێتی نازانێت.

٤- کەوابوو ئێدی بۆچی شیعر و هونەر بەگشتی بە دراوسێیەکی هەژار لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا ببینین؟ ئەوانەش چەند زۆرن کە مومارەسەی چێژ بە گاڵتە جاڕی و ریسوایی دەکەن دەیکەنە گۆچانێک یان هۆزێک و بەرق و کینە پیسی دەکەن. لە هەمووشی مەترسیدارتر لەم مومارەسەیەدا ئەوەیە کە لە ئاستی دامەزراوەکاندا جێبەجێ دەکرێت.

لێرەدا نامەوێت باس لە شیعر یان هونەر بکەم لەڕووی بڵاوکردنەوە و گشتاندنی، بەڵکو دەمەوێت وەکو دیاردەیەکی ئەفراندنگەرایی قسەی لەسەر بکەم. هەر وڵاتێکی عەرەبی وەکو ئەوەی پێویستە کە ستایشی ئەم دیاردەیە بکات؟ بودجەی هەر وڵاتێکی عەرەبی بپشکنن، ئەوا دەبینن کە پشکی ئەم دیاردەیە هیچ ناکات بە پێوەر بۆ پشکی دیاردەگەلێک کە هیچ رۆڵێکی نییە لە دەستگیرۆیی پێشکەوتن یاخود دەستگیرۆیی مێژوو.

بەڵام مەزەندەی نەتەوەیەک بکەن، کە بەمافی تەواو بە دیاردەی ئەفراندنگەرایی نەدات و لە شوێنی شیاوی خۆیدا داینەنێت: چی لێدەمێنێتەوە؟ حانووتێک لێرە و دیوارێک لەوێ، رێگای پەرستگایەک لەوێ. تەنانەت یادکردنەوەیەکی رامیاری و تەنانەت باسکردنی دامەزراوەکانیش هەرچەندە مەزن بن، لەگەڵ خاوەنەکانیدا دەسڕێنەوە بۆ ئەوەی یادەوەری و دامەزراوەکانیتر جێگایان بگرنەوە. مێژووی رووی ناهونەریی ـ ئەفراندنگەرایی لە ژیانی گەلاندا دواجار بریتی دەبێت لە پۆلێنکراو و بەڵگەنامەکان: مێژوو لە ئاستی ژیانی رۆژانەدا پێویستە و رەنگە جوانیش بێت، بەڵام مێژووی قوڵتری کە ماوەتەوە شتێکی ترە: کە لە ئەفراندن و دەستکەوتەکانیدایە. کەواتە لە تەم و مژی رۆژگاری بەهێزترەوە دەرناچێت، ئەگەر رۆژگاری ئەفراندن نەبێت.



لەبەرئەوە ئەفراندن لە نەتەوەیەکە کە کرۆکی کەسایەتی و سیمبولی تیشکدان و رەحمی داهاتوو و هێزی پالنەرێتی. هەر لەبەر ئەوەشە کاتێک نەتەوەیەک لە شاعیرانی ئەفرێنەر بێ بەش دەبێت، ئەوا زمان و رۆشنبیرییەکەی دەمرێت. لەوانەشە رۆشنبیرییەکی تر داگیری کردبێت و هەڵمژیبێت. هەر نەتەوەیەکش ئەفراندنی بەردەوامی تیادا نەبێت، ئەوا هێدی هێدی لە ئەفراندنەکانی رابردوو دەپارێزێت.

... کاتێکیش هەنووکە ئێمە دڵمان دەشکێت و بە دیارکردنەوە ئەوەی تێپەڕیووە لە دامەزراوەکان ناچاری ناکەین بەڵکو بە دیارکردنەوەی ـ امری القیس ـ و بە یادکردنەوەی ئەفرێنەرانی گەورەی سەرجەم گۆڕەپانەکان، کە ئەو یادکردنەوەیەش گوزارشتە لە چەند سەدەیەک. وەکو ئەوەی زۆردارەکان پەرش و بڵاویان کردبێتەوە و پادشاکانیش سڕیبێتیانەوە. ئەبوتمام ماوەتەوە، ئەمەش واتای ئەفراندنە، لێرەدا مێژووی راستەقینەی گەلان لەخۆ دەگرێت. چونکە ئەبوتمام و نموونەکانی هەستیاریی ئێمە نوێدەکەنەوە و وزەمان بۆ ژیان زیاد دەکەن.

کەسانێک هەن کە مرۆڤ رابەرایەتی دەکەن و بەرووکەش بە سیاسییان دەکەن، کەسانێکی تریش هەن ئەمە لە قوڵاییدا دەکات: کە هەر ئەمەشە رۆڵی ئەفراندن. کام سیاسەتمدار بەواتای وشە، توانیویەتی یان دەتوانێت کاریگەری لە بونیادی دۆستانەی بوونی مرۆڤی بکات یان رابەرایەتی تیمی مۆسیکی قوڵایی دەکات. ئەوە شاعیرە کە ئەوەی کردووە و هونەرمەندیشە ئەوە دەکات. چونکە ئەفراندن ئەو دەنگەیە، کە بە بەرزی و زۆر بە تەواوی گۆرانی دەبێژێت. لەمیانەی دەنگەوە ئەو ئەبەدییەی کە لە رێگەی ئەو زەمەنەی لەیەکمان دا دەترازێنێت، سارێژ دەبێتەوە.

# مرۆڤ، بێ شوێنە

**١. هەڤپەیڤین:**

محمــد مهــدی الجــواهری، میــوانی لوبنانــە و، وەکــو ژیلــەمــۆ دەگـەشـێتەوە و خۆڵـەمێشیـشی لـە پیربـوونی زیـاد ناکـات، جگـە لـە گەشانەوەی نەبێت. دەڕوانێت و گڕ دەگرێت. دەپەیڤێت و گڕ دەگرێت.

ئەو کڵپە سەرکێشەی کە لـە قوڵاییدا دەتـەقێتـەوە، کڵپەی ئازادییە، کڵپەی روانین و داهاتووە. دان بەوەدا دەنێم رایچـەنیم. لـەو بـاوەڕەدا نەبووم کە ئەو لەو پلەی تووڕەبوونی خولْقاندنەدا بێت. پێشم وانەبوو کە دەنگی تا ئەو ئاستە پڕبێت بە زایەڵەی ئەزموون و مێژوو.

بۆ خـۆی رایچـەنـیم: مـن وام بـە خـەیاڵـدا دەهـات، تـەنیـا بـازێکی پێدەشـتەکـان بێـت، ئـەویـش لـەڕێگـەی ئـەو قـەسـیدەکـەمانـەی کـە خوێندبوومەوە لەڕاستیدا بازی پێدەشتە، بەڵام هـەردەم بـە جوانی و ئـەڤین و هاوڕێیـەتـی و ژیـان و ئـافرەت ئـەفسوونگیرە، تـەنانـەت لـە هەمبەر هەموو ئەوانەدا چەشنی منداڵێکی نیانە.

* واتای نیشتمان، بەلای تۆوە وەکو شاعیرێک کە لە تاراوگەدایە و وڵاتی خۆش دەوێت، واتای چیدەگەیەنێت؟

– حـەزم بـە تاراوگـە نییـە... وەلـی بـۆ خـۆی مـاڵی خێزانـی یـان نیشتمانم بەلاوە گرنگ نییە. مرۆڤم بـەلاوە گرنگـە نـەک نیشتمان. مـن نیشتمانی خۆمم لە هەموو نیشتمانەکانی تر پێ لە پێشترە، ئەویش بە جوگرافیاکەی نا، بەڵکو بـە مرۆڤـەکانی. مرۆڤیش هێشتا لـەوڵاتـانی ئێمـە



دواکـەوتـووە. منـیش بـۆ خـۆم بـەسـەر مرۆڤـی دواکـەوتـوودا، بـەسـەر دواکەوتوویدا شۆڕشگێڕم.

* ئەم دواکەوتووییە لە کۆیدا بەدەردەکەوێت؟

– لەهـەمـوو شـتێکدا. مـرۆڤ لـەلای ئێمـە ئـازادیی پشتگوێ خستووە. هەڵسوکەوتی مرۆیی و ژیان ئەفەرووزە کردووە.

خـۆی و ئـاوەزی لـە ئـەفسانە و نیـشتووی نـەوەکـان و بـاوەڕگـە و ئایینزاکان، لە وێنە شـێواوەکانی بە تایبـەتی، پاکنـەکردووەتـەوە. مرۆڤ لەلای ئێمە لەو ماڵە دا کە تیایدا نیشتەجێیە دواکەوتووە، لە شەقامدا لـەو پیشەیـەی پێوەی خـەریکە، هـەر ئـەڵێی بە بـەرد بـووە، بە تێپـەڕبـوونی نەوەکان و ئاوەژوو بوونی مێژوو، پێی خستە قۆناغێکەوە کە بـەدوای قۆنـای جاهلییـەتـی خـاوێن دا دێت، بـە بـازدان نـەک پـێ بـەپـێ. هـەر لـە رۆژانی بەراییەوە بناغەی پەتا کۆنەکەی، چەشنی شڵەژانێ بوو لە یەکەم هەنگاویدا.

* ئەم پاشکەوتوویییە رەنگدانەوەی بۆ سەر شیعر... هەبوو؟

– بەڵێ. شـیعرمان لـە بـەرزتـرین نموونـەیدا، دواکـەتووە. باشـترینیان لـەگـەل بارودۆخمانـدا گونجـاوە. ئـەوەی کـە هـەمانـە و کـەمتـر خراپـە، چاکەکەیانە، کە پیتە عەرەبییەکان بـەرجـەستە دەکات. لـەبـەر ئـەوە پێی سەرسامین. لە ئاستی خۆماندایە، هێندەی خۆمانە ئەگەر شیعری خۆمان، لە نێویشیاندا شیعرەکانی مـن بـە ئـەوانی تری بـەراورد بکـەین، دەبینین دواکەوتووە سەرباری ئەو زیادەرۆییەی کە لە دەوریدا دەچنرێت. وێرای لەخۆ بایبوونمان... شیعرمان دواکەوتووە، چونکە ئامرازی نـەتـەوەیـەکی دواکەوتووە.

مەحاڵە کە شیعر جیابێتـەوە، بازبـدات و بـەتـەنیا پێشکەوێت، چونکە هەمووی بە عروبەوە گرێدراوە. ئەو فاکتـەرانـەی کـە عـەرەبی ملکـەچی

دەبێت، هەر هەمووی بۆ سەر شیعر ڕەنگدانەوەی دەبێت و دەیخنکێنێت. ڕەنگە شاعیری عەرەبی لە شیعر، دێوەزمەی سەراپاگیر، باڵاتر بێت و دەرچوونیش لێی گران، گران... بێت.

بۆ نموونە دەمەوێت لە بارەی ئافرەتەوە ئەوە بێژم، کە هەر شاعیرێکی بیانی دەیڵێت. ناتوانم.

* وەلێ لە مێژووی دێرینماندا، شاعیران ئەوەی ویستوویانە گوتوویانە...

– ڕاستە. بەڵام دەربڕینیان لەگەڵ ئەوەدا سنووردار بووە لە زەمەنێکی سنوورداردا. لە جاهلیەتدا. ماوەیەکی دیاریکراو و کورتخایان لە سەردەمی عەباسیدا، کە سەد ساڵ تێپەڕ ناکات. ئێمەش وامان لەو ماوەیە کردووە کە خەونێکی زێرینە و خۆمانی پێهەڵدەکێشین و لەسەری دەژین. کە ئەمەش ڕێسایەک نییە.

* ئایا گەشبین نیت بەدەرباز بوون لەم دێوە زمەیە؟

– بەڵێ. بەڵام لەو بڕوایەدانیم کە دەربازبوون بەمنزیکانە بێت.

* ئایا شیعر بۆ خۆی ئەم دەرباز بوونە نزیک ناکاتەوە؟

– بەڵێ. وەلێ شیعر بەویستی گۆڕانکاری سیخناخ دەبێت، هەروەها تاکی عەرەبیش خاوەنی هێزێکی ئیرادەیی بێت تا بەرەنگاری ئەمێستا و رابردووی پێبکات. ئەگەرنا دەربازبوون نابێت. کە قوربانیدان و شەهید بوونی گەرەکە. ئێمە لە قوربانیداندا کەمتەرخەم بووین. قوربانیدانەکانمان ساردبوون.

نەپساوە و بەردەوام و یەکلایی کەرەوە نەبوون، ئامانج زۆری لێکەم کردووەتەوە. ئامرازی سەرکردایەتی کردن ئاراستەکەر نەبووە، قوربانییەکان بێ بەهابوون. لەسەرو ئەمەشەوە، ڕەنگدانەوەی بۆ سەر



ژیان و کۆمەڵگە خراپ بووە. دواکەوتوویی مشتی پۆڵایینی توندتر و زیاتر بووە.

* ئایا، کاتێک لە چوارچێوەی جیهانە سنووردارەکەیەوە لە شیعری عەرەبی دەنۆڕیت، پێی ڕازیت؟

– نەخێر. چونکە لە توانایدا هەیە کە چاکتر و پتر کاراتر بێت. کە کۆمەڵگەیەکدا پەرەدەستێنێ کە ئازادی ناناسێت. کۆمەڵگەیەک کۆیلایەتی پەروەردە دەکات. لێرەوە دواکەوتوویی شیعر و کەمتەرخەمی پێشڕەوانی ڕۆشنبیری عەرەبی خۆی دەبینێتەوە. ئەم پێشڕەوانە دەزانن کە کەمتەرخەمن و هەروەها ئەو ڕێگایەش دەزانن کە کۆمەڵگەی پیادەکێشن، لە پێناو گۆڕینیدا.

* بە تیورەیی، ڕەنگە. وەلی چلۆن لەڕووی پراکتیکییەوە ئەم ڕێگایە بگرێتەبەر؟

– پێویستە کۆدەنگ بن بۆ پێداکێشانی هەموو ئەوەی کە لە کۆمەڵگەدا هەیە، ئەگینا پاشەکشە دەکات، ئەگەر قوربانییەکانیشی چەندبێت. بەڵام تاوەکو ئەمێستا ئەو کۆدەنگییە ڕووینەداوە. لەبەر ئەوە من باوەڕم بەم پێشڕەوانە نییە ـ بەلانی کەمەوە باوەڕم بە توانای نییە.

* لەمیانەی ئەم دیدەی تۆدا، شیعر بەلای تۆوە چییە؟

– شیعرم بریتییە لە من، لە کەسێتیم. ئەز بە بێگەردی شاعیرم هەروەها من یەکێتی وشە و ژیانم. مەحاڵە مرۆڤ ببێتە شاعیر، ئەگەر لەنێوان ئاخاوتن و ژیانیدا، یەکێتی دانەمەزرێنێت. من باوەڕم بە شاعیرێک نییە کە ژیانی شتێک و شیعریشی شتێکی تر بێت. بۆ دوورتر دەڕۆم و دەڵێم، کەسایەتی شاعیر پڕ بایەخترە لە شێوازی دەربڕینی. گرنگ وەکو ئەوەی من دەیبینم، کارتێکردنە لە کۆمەڵگە.

من لە عێراق گەورە بووم. كە بۆ چەند جارێك بە ژیان و وێنەكانی كاریگەر بووم، تەنانەت ئەوانەی لە دەربڕین دا بەهێز یان ناسكبوون لە شیعردا. هەرگیز هەستم بەوە نەكردووە، كە هێز دەمبەزێنێ جگە لەوكاتەدا نەبێت كە دەستم بە خوێندنەوەی ڕەسافیكرد. ڕەسافیش وەكو دەزانیت لەڕووی هونەرییەوە لە لوتكەدا نییە، وەڵی كەسایەتی بەهێز بوو، كە زۆرشتی گۆڕی.

لێرەوە واتای قسەكەم ئەوەیە، كە شاعیری عەرەبی، ڕەنگە بەهێز و باشبێت لە شیعرەكەی. كارێگەری ڕەسافی بۆ سەرمن یەكلاییكەرەوە بوو، تەنانەت كەسێك نابینمەوە كە جێگەی بگرێتەوە.

دیسان سەیری " الأخطل" لەسەردەمی عەباسیدا بكە، كە شاعیران و كۆمەڵگەی بە خێرایی و بە گوڕ لەرزاند ."أبونواس" كە جێگەی سەرسامییە و زیاتر بوو لەوەی كۆمەڵگەی عەرەبی بلەرزێنێ ، ئەمیان بەسەر هەرشتێكدا یاخی بوو كە بە دڵی نەبوو یان پێی ڕازی نەبوو، هەموو ئەوانەی لەرزاند كە دواكەوتووەكان چۆكیان بۆ دادەدا، ماوەی عەباسییەكان كورت و سەرسامگیر بووە كە بە لەرزینێكی گەورەی كۆمەڵگە، لەلایەن " المتنبی" كۆتایی هات. بەدیدی من بەهای شیعر بە توانای دەربڕینی لەڕووی ژیانی یان هونەرییەوە دەپێورێت.

* لەم ڕووەوە چۆن لە شەوقی دەڕوانێت؟

ڕێزی لێدەگرم. بەنموونەی یەكەم لە داڕشتنەوەی هونەریی لەسەردەمی نوێدا دەیژمێرم. بەشێوەیەكی سەرسامگیربازی بەشیعردا.

لێرەشدا مەبەستم لە هەموو شیعرەكانی شەوقی نییە، بەڵكو مەبەستم لە هەندێ لە نموونەكانیەتی. پێویستە دیسان بەهۆی باری كۆمەڵایەتییەوە بەڵام بە شیعرەكانی بەهێز بووە. ئەو كەسێكی ئەفرێنەرە. لەوانەیە یەكەم ئەفرێنەر بێت و ڕەسافیش لەڕووی هونەرییەوە لەم



لاوازتر بێت، وەلی لە كاریگەرێتی لە ژیان و كۆمەڵگە و مێژوودا لەو بەهێزترە.

* باوەڕبوونت بە گۆڕانكار، گرنگییەكی تایبەت بە بۆچوونت دەدات لە بزوتنەوەی شیعری عەرەبی نوێدا. ئیدی چۆن لێی دەڕوانیت، ئەگەر لەمپەڕ و كەم و كورتییەكانمان خستەلاوە؟

– پرسیارەكەت بۆ خۆی وەڵامیشە. من نموونەگەلێكی دیاریكراو و كەم دەنرخێنم، بەڵام ئەوە بەسە بۆ گەشبینیم بە داهاتووی شیعری عەرەبی. نموونەیەک یان دوو نموونە ئەوەی سەپاندووە كە بۆچوونم لەبارەی شیعری نوێوە بگۆڕم، هەندێ لەوانەی كە "بدر شاكر ئەلسەییاب" بەرهەمی هێناون نموونەی بەرزییانە.

* پاش شیعر، ئەڤین... دەبێت ڕۆڵی خۆشەویستی لە ئەزموونی شیعریتدا چییە؟

– ئافرەت ڕەگەزێكی ئەكتیڤە لە پێكهاتەی ژیاندا و ڕەنگ و تام و بۆنێكی پێدەبەخشێت. بەبێ ئەو وێنای ژیان شێواوە. ڕەنگە نەزانێت كە من یەكەم بووم، لەم ڕووەوە كۆمەڵگەی عەرەبیم پیا ڕاكێشا. هیچ شاعیرێكی عەرەبی لەسەردەمی نوێدا، نەگەیشتووەتە ڕاشكاوەیی تەواو و هەمەكی ئەوەی كە شیعری من پێگەیشتووە. ڕەسافی قەسیدەیەكی بە ناونیشانی "عریانە" نووسی و دەیشاردەوە، منیش لە بیستەكاندا قەسیدەی "جربینی"م نووسی و هەموو كۆمەڵگەی ڕاچڵەكان، تا بە گژمدا هاتنەوە و ئەو كاتە هەڕەشەیان لە ژیان و چارەنووسم كرد. هەروەها جگە لەوەش چەندین قەسیدەی تری بوێرم نووسیوە، كە بوێری پیتی عەرەبی خەریكە بەرگەی ناگرێت و لە چەشنی دا سەردەمی نەبووە. ئەم قەسیدانەش گوزارشتە لە دیدی من بۆ ئافرەت و بەرجەستە كردنی تێڕوانینەكانی منە بۆ ئەو.

* من زانیومە کە بوونت لێرە بۆ سەرپەرشتی کردنی بە چاپ گەیاندنی هەموو بەرهەمە شیعرییەکانتە لە دیوانێکدا، ئاخۆ ئەو قەسیدانەش بەشێکن لەمە؟

– بێگومان ئەگەر بە چاپ گەیەنرا. چونکە لێرە سەرسام بووم بەوەی کە رەنگە چاپکردنی دوابخرێت ئەویش بەو هۆیانەی کە بڵاوکەرەوە دەیزانێت، خۆزگە لێتدەپرسی، چونکە زانینی بۆ شیعر و شاعیران بەسوودە.

* وەکو چۆن لە شیعرەوە چووین بۆ ئەڤین، لە ئەڤینیشەوە دەچین بۆ مەرگ. چۆن لە پەیوەندی نێوان ئەڤین و مەرگ دەڕوانیت.

– جوانترین قۆناغ لە ژیان دا، ئەو قۆناغە راوەستاوەیە کە لە نێوان ئەڤین و گۆڕدا هەیە. چەندە جوانە ماوەی نێوان ئافرەت و گۆڕ. ئەڤینی مەزن جگە لە مەرگ هیچ شتێک پێی یەکسان نابێت پیاویش خۆراکی ئافرەتە. پیاو بە ئەنقەست و بە مەبەست  بەرەو مەرگ، بەرەو ئەڤین ـ مەرگ دەڕوات. ئافرەت مەرگ بۆلای دێت. پیاو بۆلای مەرگ دەچێت.

٢- سڵاو:

شیعری جەواهیری لە دەروونمدا ئاوێزانی نیگەرانی ئازادیبوون دەبێت و بە نیگەرانی تازە بوونەوەشەوە گرێدراوە. لەیادەوەریمدا لەو رووناهییەی کە بەنزیکەیی نیو سەدە دەبێت لە دایک بووە جیانابێتەوە، کە پرشنگدەدات و لە نەسرەوتن و جوڵەدایە. شیعری ئەو بەلای منەوە، جوڵەگەرایی تێکۆشانە و نووسینە، کە بەپیر ئەمێستا و بزاڤگەراییەکەیەوە دەچێت. هەروەها لە پێشەنگی پێکهاتە شیعرییەکانی ئەو کەشە شیعرییەیە کە من تیایدا پەروەردە بووم.



خەریک بوو زمانی شیعر ببێتە دەمامکێک بۆ داپۆشینی واقیع، ئیتر جەواهیری بۆ زەرورەت لایەنداریبوونی، لە دژی ئەم زمانە و لە دژی کۆنسێپت و ئەو ئارەزوانەی کە بە سەریەوە ئێشکگربوون دامەزراند. ئەوەی بۆ شیعر دامەزراند کە بە وەسفکردنی واقیع ئیکتیفا نەکات، بەڵکە تیایدا ئاشکراکەر بێت و، دیدی گۆڕانکاری پێ بپۆشێت. لەمەشدا شیعری جەواهری ئەو متمانەگەراییە دەهەژێنێ کە ئەو دەمامکە زیادی دەکات و رێگە دەکاتەوە بۆ روانینێکی تازە بۆ شتەکان ـ لە دەلالەت و رەهەندە بگۆڕ و گۆڕاوەکانیدا. ئەمە رووداوە لە دەروون دا و زمانیش لەگەڵ رووداو لە ژیان و زەمەندا هاوجووت دەبێت ـ هێما کراو و سەرخراوە. لەگەڵیدا رێگایەکی تازە لە هەستکردن بە شتەکان چێبوو، هەروەها خودی شاعیر دەرکەوت، بەو وەسفەی نا کە تێرامانێکی رۆمانسییە یاخود یاخیبوونێکی یۆتۆپیاییە، بەڵکو بەو وەسفەی تەقینەوەیەکە و پێکهاتنی زەمەنی  عەرەبی، هەر لە وشیاری چرکە ساتی ئەمێستاوە بۆ روانین لە چرکەساتی داهاتوو ئامادە دەکاتەوە. ئەمە شیعری گەیاندنی مەعریفی و پراکتیکییە، کە پێشەکییەتی بەمەدلول یان واتا دەبەخشێ. لەمەشدا ئەمە شیعری "ماتریال" ییە، کە لە سەر دوو رەهەندی بنەڕەتی هەڵدەستێت: یادەوەری و دەستپێشخەری. لە یادەوەرییەوە کۆپلەکان و لە دەستپێشخەریشەوە مێژوو دروست دەکرێت.

## ڕاوەستابوو، کاتیش پاساییە و تێدەپەڕێ

دەنگێکی جاهلیەت بوو، لە جەستەیەکەوە دەردەچوو، کە لە سەدەی بیستەمدا دەجولێت. نموونەی بەرگریی گۆڕانکاری بوو: ئەو بەردێکە و کاتیش پارساییە و تێدەپەڕێ.

لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر پێم خۆش بوو پێیبگەم و گوێی بۆ رادێرم: شاعیرێکە، کە یادەوری مێژووگەرایی بەرجەستە دەکات، بە شێوەیەک کە لەو یادەوەرییەدا ستراکچەری و ویژدانی لەگەڵ ستراکچەری فیکریدا هاوتا دەبێت. خەون دەبینێت و لە خواستی گەڕاندنەوەدا دەژی. لەم خواستانەشدا وەهم ئامێز دەبێت، هەندێک جاریش وەهم جوانە. کە پێکهاتەی رابردوو ئەگەڕێنێتەوە، هەمان ئەو هێزەی کە دروستی کردووە، ئامادەی دەکاتەوە. وەکو ئەوە دەردەکەوت کە لە پاڵنەری ژیاندا نەژی، هێندەی ئەوەی لە پاڵنەری یادەوەریدا دەژی. هەروەها تورەشە، لە جۆرێکیتر. رۆژگاری عەرەبی ئەمێستا هەر بەتەنیا کەوتن نییە وەکو ئەو دەبینێت. بەڵکو دادوەرێکیش بوو بەوکەوتنە بەبیر دەهێنێتەوە. وەکو گەواهیدەرێکیش بەبیرمان دەهێنێتەوە، کە ئێمە بە تورەیی، لە جۆرێکیتر دەژین. بە مێژوومان کە هێشتا بە شورای زۆر لە سەری هەژاران و شمشێری سوڵتانەکان دەورە دراوە.

ئەویش " أحمد الصافی النجفی"یە. لە دوا دیدارماندا، لەبارەی زۆرشتەوە دوایـن. لە پاش کۆچیشی بۆ ستایش کردنی لە گواستنەوەی بۆ خوێنەران و دڵخوازانی باشتر، شتێکی تر نییە.



١- "بەشێوەیەکی گشتی، شیعری جاهلی بە باشتر دەزانم لە شیعری تری عەرەبی، بەلام لە هەموو شاعیرانی عەرەب نا، ئەو شاعیرە عەرەبییەی کە پێی کاریگەرم موتەنەبییە.

من المتنبي فی روحُ تردّدُ
فحسبی منه اسم ویرض و سؤددُ
یوحدنا فی الرّوح دار و مهجر
و یجمعنا فی الشعر فن و حسدُ
اتی متنبیّ الشعر والرّوض یجرد
و جئت و روض الشعر منه مورّدُ
فلا تعجبوا إن غطت الشمس أنجماَ
عجیبُ بجنب الشمس، شمس توقد

شیعری جاهلی، شیعری سروشتییە کە " زهیر بن ابی سلمای" گوزارشتی لێکردووە، کاتێک طکەعبی کوڕی لێپرسیووە: باوکە، شیعر چییە: دەڵێت: " شیعر شتگەڵێگە لە دەروونماندا کۆ بووەتەوە و لەسەر زارمان دەڕوات". من وایدەبینم کە هەموو شتێک لەو پێوەرە دەردەچێت، نەک هەر شیعری سرووشتی، بەڵکو شیعری دەستکردیش، جیاوازی نێوانیشان وەکو جیاوازی نێوان گوڵی سرووشتی و گوڵی دەستکردە.

لەهەموو شیعرەکاندا بە شێوازی شیعری جاهیلی ئاسودەم بە گوتەیەکیشم گوزارشتم لەوە کردووە:

بإبداعی الأشعار لا أتکلف
متی رمت إبداعی، من البحر أغرف
نییت بشعری عن قدیم و محدث

فشعری کروحی جاهلی مثقف

واته من وامکردووه " امرو القیس" لەم سەردەمە دا بژی، هەروەکو چۆن شاعیرانی جاهلییەت گوزارشتیان لە خۆیان و ژیانیان کردووە، منیش لە دیوانەکانمدا گوزارشتم لە خۆم و ژیانم کردووە، لەگەڵ جیاوازی ژیانی من و ژیانی ئەوان، دەروونی رۆشنبیرم و دەروونی ئەوان، بەڵام لە رۆحیان دەرنەچووم".

٢- " لە دیوانی ـ الاغوار ـ دا قەسیدەیەکم لە بارەی مردنەوە بە ناونیشانی ـ انشودە الموت ـ هەیە، کە تیایدا مردن لە ژیان بە باشتر دادەنێم. جیهانێکی نادیار لە مردندا هەیە و کێشم دەکات، کە ناتوانم راڤەی بکەم... کاتێکیش مرۆڤ بی هۆش دەبیٚ، چێژی مەستی بوون دەگاتە لوتکە. مردنیش جۆرێکە لە بیٚ هۆشی. وەکو خۆشەویستییە، کە ئەویش دیسان، بیٚ هۆشی و لەناوچوونە".

٣- " رەشبین نیم. ئەز بە سەر هەموو شتێکدا شۆڕش دەکەم، رەشبینیش شۆڕشگێڕ نابێت، بەڵکو بەزیو دەبێت. من گوتوومە:

یروق لی تمردی فیشتهی
تمرداً حتی علی التمرد

٤- رازی نەبووم چوارینەکانی خەیام کە وەرمگێڕابوون، سەرلەنوێ بە چاپبگەیەنرێتەوە. چونکە بەو وەرگێرانە ویستوومە خزمەت بە هونەر و شیعر بکەم... پاشان بۆم روون بووەوە کە من زۆرێکم بینیووە کە وەرگێڕدراوەکەم لە مەیخانەکاندا دەخوێننەوە و لەرێگەیەوە داکۆکی لە مەستبوونەکەیان دەکەن. منیش لەوە بێبەریم. لەبەر ئەوە ناخوازم سەرلەنوێ دووبارەی بکەمەوە، چونکە کاتێک رێگە بە چاپکردنەوەی بدەم، هەست بەوەدەکەم کە من ئەوە لەنێو دەستی خوێنەراندا دادەنێم، کە هانیان بدەم بۆ بەدکاری...".



٥- " أبو العلا المعری، لەبیرکردنەوەی ئازاد و مرۆڤایەتی خۆیدا مامۆستامە".

٦- " ئافرەت؟ بە هاوسەرییبوون؟

وهل کامل عقلاً یسلم أمره
لناقص عقل، أو یشارکه مأوی

ئەمە بۆچوونی منە لەمەڕ ئافرەت و گوێش بۆ بۆچوونم رادێرە لەبارەی بە هاوسەرییبوون:

یقولون: فی التزویج للمرء صحه
تزوّج لتشفی من سقام ویحزان
فقلت: ولو أشفی، کما قد زعمتم
فأن زواجی ذاته مرض ثان...".

## درۆ/ راستگۆیی
## وتووێژ لەگەڵ عومەر ئەبو ریشە

لەدیدارێکی دۆستانەدا گوێم بۆ عومەر ئەبو ریشە شلکرد، کە باسی لە شیعر دەکرد. ئەو بەلای منەوە" زانیار"ی یەکەمینە کە لە ژیاندا ماوە. ئەمەش شرۆڤەی ئەو کڵپەیەی ناوەوەی نێو وشەکانی دەکات، کە هەموو شوراکانی تیغ دەکرد، شوراکانی شەو و رۆژ، ئەشکەنجە و هەژاری، بەدبەختی و مەرگ، هەروەکو ئەوەی ئەفسوونێکی ژیان بەخش بێت، کە لەهەمان کاتیشدا دەیبینین بە هێواشی بەرەو قوڵایی ئۆقیانووس دادەخلیسکێت.

ئەم باوەڕدارییە دڵنیای کردمەوە و پێکەوە رۆڵی شیعرمان لە پەرینەوەی بیابانی بەرفراوان کە بە رۆژگار ناوی دەبەین دووبارە کردەوە. هەروەها ئەو یەقینەشم لە لا زیادی کرد کە شیعر بروسکەیە و بە هەمیشەیی ماوەتەوە و دەمێنێتەوە لە تاریکایی جیهاندا.

بەشیعر ( شیعر بە واتای بەرفراوانی وەکو هەڵوێست و روئیا) ـ خۆمان لە ژەنگ پاکدەکەینەوە. ئەوەی هەبووە رەتیدەکەینەوە لە پێناو ئەوەی کە ببێت. ناشرین تێدەپەڕێنین بۆ جوان. لەجوانیشەوە بۆ جوانتر. شیعر هەمیشە بە ئاراستەی داهاتوودا بە ئاراستەی خۆمان دەمانبزوێنێت. مرۆڤیش، مرۆڤە هێندەی ئەوەی لە ناو ئەو نیگەرانییە بزۆزەی کە عومەر ئەبو ریشە بە یاخیبوون ناوی دەبات، نیشتەجێیە.

دەڵێت: شیعر یاخیبوونە و کۆتایی نایەت، بە بەردەوامی تازە دەبێتەوە. شاعیریش، ئەو شاعیرە کە بەسەر واقیع و ژیانەکەیدا یاخیدەبێت. شیعرم یاخیبوونە بەسەر بارودۆخمدا، بەسەر ئەوەی کە منم...

لە رووناهی ئەم یاخیبوونەدا ژیان چییە؟ وەکو عومەر ئەبو ریشە وەڵام دەداتەوە" ئاوێنەیەکە و بەرجەستە بوویەک دەداتەوە کە شیعرە.



چیرۆکێکی تێپەڕبووە. هەرچی شیعریشە درۆی ئەفرێنراوە کە دەبێتە هەقیقەت..." ژیان لەناوچوونە و شیعریش دەمێنێتەوە.

بەم پریشکە زیندووە، شاعیر لە جیهان ـ جوانی، ئافرەت، ئەڤین، رامیاری، پیشەسازی و ئامێر، مەرگ و ژیان، دەنۆڕێت.

عومەر ئەبو ریشە دەڵێت، جوانی:" رەهایە و کۆت و بەند ناکرێت. ئافرەتیش شکۆمەندترین دەرکەوتەکانی جوانییە، هەروەها تەنیا رەهایە بەڵام بە فۆرمی جۆربەجۆر".

لەبارەی رامیارییەوە دەبێژێت،" سیمایەکە لە سیماکانی ژیان، رەنگە شاعیر بتوانێت خۆی پێوە هەڵکێشێ و بەرەو تەواوتر باڵاتر پاڵی پێوە بنێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆدەرخستنێکە و نامێنێ".

ئەی ئامێر و پیشەسازی؟ کاتێ گوێ لە عومەر ئەبو ریشە دەگریت، بە شێوەیەکی سۆفیگەرایی نهێنئامێز، ژیانگەرایی ئاسایی، دەدوێت، هەر چەندە ئەوە بە کەمی لە شیعرەکانیدا دەرکەوتووە. بەڵام سەرباری ئەوە، لە خوێنیدا هاتووچۆ دەکات ـ هەست بەوە دەکات، وەکو ئەوەی بڵێت، مرۆڤ ناتوانێت بە ئامێر یان بە پیشەسازی بێت بە واتای قوڵی ژیاری، گەربێتو شاعیر نەبێت. چونکە شیعر تەنیا هێزە کە مرۆڤ دەپارێزێت لەوەی کە هێزی پیشەسازیی میکانیزمی هەڵیلوشێت و بۆ شتێک لە شتەکان بیگۆڕێت. لەبەر ئەوە بۆ ئەوەی بە مرۆیی بمێنێتەوە پێویستە بە شاعیری بمێنێتەوە و لە ئامێر و پیشەسازی بگات.

وەڵێ مرۆڤ ـ ئامێر ناتوانێت لە هیچ بگات: نە لە خۆی و نە لە جیهان و نە لە ئامێرەکە خۆشی. لەم گۆشە نیگایەوە لە دەلالەتی قوڵی سۆفی و رەهەندی مرۆیی ئەوە دەگەین کە عومەر ئەبو ریشە لەبارەی مەرگەوە دەیڵێت: "ئێمە نامرین، ناتوانین کە بمرین..".

## ئەلسەیاب: پاش نیو سەدە لە دایکبوونی

١- لەکۆتایی ئەمساڵدا ١٩٧٦، نیو سەدە بە سەر لە دایک بوونی ئەلسەییابدا تێدەپەڕێ (لە ساڵی ١٩٢٦ لەدایک بووە)، هەروەها دوانزە ساڵیش بە سەر مەرگیدا تێدەپەڕێ ( لە ساڵی ١٩٦٤ مردووە). بە واتایەک، جوانترین قەسیدەی بە عێراق و گشت رۆشنبیریی عەرەبی بەخشی، کە لەنیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا بەرهەمی هێنابوون و، لە نێو جوانترین شیعری عێراقی بەتایبەتی و شیعری عەرەبی بەگشتی لە هەموو مێژوویدا دادەنرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا لە تاراوگەدا مرد و دیسانیش تا ئاستێک لە تاراوگەدا ژیا. ئەو هەستی بەوە دەکرد کە مردنەکەی مردنی نامۆبوون دەبێت، کە ئەمەش بە سۆی و غەمگین تر دەبێت لەوەی هەست بەوەبکات، کە مردنەکەی مردنێکی ئاسایی دەبێت. چونکە نامۆبوونی شاعیر یان هونەرمەند بە شێوەیەکی گشتی، حاڵەتێکی ئاڵۆزترە لە نامۆبوونی بۆ نموونە، کارشوناسێک یان سیاسەتمدارێک.. ئەوەی دووەمیان بە ئاسۆیی، بە رووکەشە، چونکە نامۆبوونە لە شوێندا و لەو رووداوانەی کە لە ئارادان. هەرچی یەکەمیشە، نامۆبوون لە قەوارە و قوڵاییدایە، چونکە نامۆبوونی ستوونی هەر بەتەنیا لە شوێندا نییە بەڵکو دیسان لە کاتیشدایە. دووەمیان بە ئامرازەکانی ژیانی رۆژانە و فۆڕم دەگات، بەڵام یەکەمیان پەیوەستە بە بنەچە کەسێتییە ژیارییەکان و دەربڕینەکانیەوە.

لێرەوە مەترسی و هەرەشە لەم نامۆبوونە دایە، لە خود و ئەو دەرئەنجامانە دایە کە پێی دەگات. ئەمە تراژیدیای ژیارییە، بەرلەوەی



کەسێتی بێت، کاتێک ئەفرێنەرانی عەرەب لە بارودۆخێکدا دەژین و لەو پێگانەدا دەجوڵێن، کە پاڵیان پێوە دەنێت هەست بە نامۆبوون بکەن. ئەمەش تراژیدیایەکی راستەقینەیە کە بە شێوەیەک لە شێوەکان، کەم یان زۆر، هەیە، جا هەیە رایناگەینێت و چرپەی بۆ دەکات. هەشە چرپەی بۆ ناکات و لە هەناویدا وەکو ژیلەمۆ گڕ دەگرێت. ئەمەشە ناچاریان دەکات، لەڕووی مرۆییەوە ـ کە ناتوانن بەبێ ئاستی مرۆڤ بژین ـ بیرکردنەوە و هەڵوێست و ئەفراندنەکانیان بەرەو ئەوپەڕی کەنارەکان دەبەن. بەسەر خۆیان و ئەوانیتر و واقیعدا شۆڕش دەکەن.

دڵنیا بوونی گێلێتی رەتدەکەنەوە و دەستلەملانی لەبەر یەکترازان و واقورمان دەبن. واز لە ژیانی ئارام دەهێنن و خۆیان رادەستی ئازادی و سەرچڵی دەکەن. کە ئەمەش یەقین و پشوودانیان پێ زیاد دەکات. ئەوان ئەوە دەبینن، کە چڵون وڵاتەکانیان بۆ گۆرەپانی ژمارە و ئامێرەکان گۆڕاوە و تیایدا گرووپەکانی بەکار بردن و ئیستیغلال کێشمەکێش و ململانێیانە و بە بازرگان و پارەگۆڕەوە و جامبازەکان ناو دەبرێن. هەروەها کە چۆن لە دۆزەخی کێبڕکێ لەسەر راوکردنی سامان و خۆپڕکردن لە دەرەوەی مەلەکوتی مرۆڤ و مەلەکوتی هزرا دادەخورێت.

٢- لێرەوە دەپرسین عێراق چی بۆ کەسێک کە جوانترین سامانی خۆی کە زیاتر دەمێنێتەوە پێ بەخشیوە؟ هەروەها دەپرسین ئاخۆ وڵاتانی تری عەرەبی چییان بۆ ئەفرێنەرەکانیان کردووە؟ پێم وایە هەموومان وەڵام دەزانین. دەپرسم و لە بیریشمدا ئەفرێنەر گەلێکی عەرەب هەیە، کە لایەنێکی مەزنیان لە ئەدگاری پڕ جوانی و دەوڵەمەندی شکۆرداریی ئەفراندن لەم قۆناغەدا فۆڕمەڵە دەکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا لە فۆڕمێک لە فۆڕمەکانی مەرگدا دەژین، هەروەکو ژیانی ئەلسەبیاب. ئایا چاوەڕوانی مەرگیان بکەین تاوەکو یادیان بکەینەوە و، لە ئاهەنگێکدا هاوسۆزییان لەگەڵدا نیشان بدەین یاخود لە گوتارێکدا؟ یان مەرگ، هێشتا جێگای دۆستانەی ئەفرێنەری عەرەبییە؟ یاخود بە دەربڕینێکیتر، هێشتا تەنیا فۆڕمی ژیانە بەلای ئەوەوە؟

٣- بەڵام لەگەل هەموو ئەوەشدا ئەلسەبیاب نوێنەرایەتی فۆڕمێکی تر و نوێی لەدایکبوونمان دەکات. هەروەها ڕێکەوتیشە کە شیعر بە سەیر و سەمەرەیی خۆی نزیک بێتەوە و لە ڕۆژێکی وەکو ئەم ڕۆژانەدا ئەلسەبیاب بمرێت: کە یادکردنەوەیەکی قەرەباڵغ و ساڵێکی تازەیە کە پەنجەرەکانی دەکاتەوە، هەروەکو ئەوەی لە کەشێکی گۆڕاودا مردبێت. پاشان لەدایک بوون لە شیعریدا کانیاوێکە و تیایدا مرۆڤ، شاعیرێک دەبینێت، کە تێدەپەڕێت و جیهانێکی تازە رادەگەیەنێت. لەبیرمە کاتێک باسمان لە شیعری عەرەبی و ژیانی عەرەبی بەگشتی دەکرد، ئەو پێداگری لەسەر بیرۆکەی لە بوون دەکردەوە، کە ئەو بیرۆکەیە سیمبولێک بێت نەک سرووتێک، تەقاندنەوەیەک بێت نەک نەریتێک، بە جۆرێک هەموو عەرەبییەک لە هۆشیدا وابژی، کە ئەو مرۆڤێکە زیاترە لەوە و بگرە لەدایکبوونێکی هەمیشەییە. چونکە کاتێک ژیان لەو لەدایکبوونە هەمیشەییە پووچەڵ دەکرێتەوە، بۆ مەرگی هەمیشەیی دەگۆڕێت، ئەوەش هەر لە دەرووندا نا، بەڵکو دیسان لە جەستەشدا: شەو و ڕۆژ تێکدەشکێن و بە تۆپەڵ دەکەونە خوارەوە و مرۆڤیش چیتر لە خۆیدا بوونی نابێت، هەروەکو ئەوەی ئەلفارابی گوزارشتی لێدەکات. بەڵکو لە ئامێردا بوونی دەبێت.



٤- بدر شاکر ئەلسەبیاب، ریشەیەکی قووڵ و تێکئاڵۆزکاوە لە ژیانی شیعریماندا. ریشەیەکە بەرەو بەرزاییەکانی بۆشایی درێژ بووەتەوە و هەڵکشاوە. بە لیریکەکانی مرۆڤ دەکاتە ئاشقێکی ئەبەدی، واتە ئاشکراکەرێکی ئەبەدی. بە بەردەوامی لە جوانترین سیمای جیهان دەڕوانێت و بە رووناهی زەمین ئاشکرای دەکات. لە نێوان (رەوان= رۆح) یدا کە وەکو سۆلاڤ بە فیرۆ دەچوو، لەگەڵ جەستەیدا، کە وەکو دەزوو ئاشتیخوازبوو. بروسکەی ژیان لە قەوارەیدا دەتەقییەوە و باڵا دەبوو. لە کاتێکدا مەرگ، جەستەیەکی تر بوو. وەکو قورسایی بەرد پێوەی لکابوو.

لە ناخۆشی ئەم مەرگەدا، هیچ شتێک لە خۆیدا هێندەی لەدایک بوون ـ سیمبول، بە جۆشەوە ئامادەیی و جوانی و دەرەوشاندنەوەی نەبوو بە واتای ژیاریی سەراپاگیر. کە سەرلەنوێ لەدایک دەبێتەوە، بە بەردەوامی، هەموو شتێک: مرۆڤ، نیشتمان. شیعر، ئەڤین.

.... لەم ناخۆشییەدا نەخەوت، مەرگ تەنیا خەونی کۆتایی بوو، بەڵام کاتێک کە چووە خەونەوە، شیعری وەکو ئێشکگر بەجێهێشت تا لەگەڵیدا بچێتە بێداربوونی هەمیشەییەوە.

٥- ئایا ساڵی داهاتوو بکەینە ساڵی ئەلسەبیاب؟
بریا شاعیران بەلانی کەمەوە بڵێن: بەڵێ.

## له بارەی " سوریال"ەوە

بە شەش ساڵ بەر لە دەرچوونی گۆڤاری "شیعر" لە بەرایی پەنجاکاندا لە دیمەشق، "ئورخان مەیسەر"م ناسی. پێکەوە تاوتوێی پرسەکانی شیعرمان دەکرد، هەریەکێکیش لە ئێمە ئەوەی بۆ ئەوەیتر دەخوێندەوە کە دەینووسی تەنانەت دید و بۆچوونمان لەبارەی هەندێک تان پۆی پەیوەست بە موفرەدات و دروستکردنی رستە ئاڵوگۆڕ دەکرد. ئەو ئینتیمای بۆ ئەو بزوتنەوە ناسیونالیزمە سۆسیالە هەبوو، کەمنیش ئینتیمام بۆی هەبوو، کەئەمەش پەیوەندییەکانمانی تۆکمە و قۆڵکردەوە.

هاوڕێیەتیمان نزیکەی پانزە ساڵ بەردەوام بوو، تاوەکو ساڵی ١٩٦٥ کۆچی دوایی کرد. گاهێک بە سەرسام بوون و گاهێکی دی بە دوودڵییەوە نووسینەکانیم پەسەند دەکرد. ئەویش هەمان هەڵوێستی لە بەرامبەرمدا، هەبوو. سەرسامبوونم بەو لەبارەی جیهانەکەیەوە دەسوڕایەوە: بۆ جاری یەکەم لە شیعری عەرەبی نوێدا، شاعیرێک هەوڵیدەدا بچێتە جیهانی نادیارییەوە و ئاشکرای بکات و پەخشان بە فۆڕمەکانی شیعری ناخەلیلی بەدەربخات.

شیعر لەلای ئەو بۆ خود و شەیدا بوونەکانی چێبوو. هەروەها فۆڕمە پەخشانییەکەی لە دیدێکی تەواو تیورییەوە سەرچاوەی گرتبوو، نەک بەتەنیا ئارەزوویەکی هەرەمەکی تا لە چوارچێوەی فۆڕمی خەلیلی دەربچێت. شیعری رۆچوون بوو بەنهێنییەکانی



دەروون و دردۆنگی و خەون و ئارەزوو و چەپێنراوەکانیدا، بەر لە هەرشتێک.

ئەو پەڕی بایەخدانی بە ئاراستەی بزاڤی ناوەوە و سیاسەتی دەروونی بوو. کە ئەمەش لە فرۆید و سوریالیزمی نزیک دەکردەوە. هەر لەم سۆنگەیەشەوە کۆمەڵە شیعرەکەی ناوی " سوریال"بوو، کە تەنیا و بچووک و بە هاوکاری دکتۆر عەلی ئەلناسری هاوڕێی شاعیری بە چاپی گەیاند. هەر لێرەشەوە شیعرەکانی بە رەهەندی میتافیزیکییەوە گرێدرا و لە " روونێتی ترادسیۆنی" دووری خستەوە، هەروەکو خۆی دەڵێت، ئەو روونێتییەی کە خوێنەری عەرەبی دایناوە.

نووسینەکانی ئۆرخان مەیسەر هەر بەتەنیا وشەکان لە کۆنتێکستی مەئلووفەوەوە دەرنانێت، بەڵکو دیسان خوێندنەوەی رەخنەییش لە کۆنتێکستی مەئلووف وەدەردێنێت: لە هەموو ئەوەش گرنگتر ئەوەیە، کە ئەم نووسینە خوێنەری عەرەبی بە جیهانی چەپێنراوەکانی دەگەیەنێت، بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەستە بە جەستەوە.

٢- لە بەرایی پەنجاکاندا ئۆرخان مەیسەر بەلای منەوە نووسینەکانی کێشەگەلی دەربڕینی شیعری خستنەڕوو، هەروەها دەرگای مشتومڕی لەسەر هونەری شیعر، روونێتی و پەنهانی و، پەیوەندی شیعر بە هرز و فەلسەفە و سایکۆلۆژیا و چەمکی فۆڕم و سروشتی زمانی شیعری کردەوە. لەو دەمەدا ورد ئاگایی باو لە وەزیفەی شیعردابوو نەک لە چییەتیدا ـ واتە لە دۆڵی شیعر لە خەبات و ئەرکی پەروەردەکردنی سیاسی و هۆشیاری نەتەوەیی ـ کۆمەڵایەتیدا بەگشتی.

٣- لێرەدا، دەکرێ بپرسین ـ پاش ئەم گەشتە زەمەنییە: بەهای " سوریال" چیە؟ وەڵامم ئەوەیە کە مێژووییە زیاتر لەوەی هونەری بێت. بەڵام لێرەدا مێژوویی پەیوەستە بە شیعرگەرایی ـ بەستراکچەری نووسینەوە، بەرهەمەندی کراوە بەڕووی پرسین و چاوپیاخشانەوە و ئاشکرا کردندا، کە ئەمەش دەرفەتمان پێدەدات کە مێژووگەراییە، خەسڵەتی دامەزراندنێتی پێببەخشین، لە کاتێکدا بەهای مێژووگەرایی لە زۆربەی شیعری بەو قۆناغەدا پەیوەستە بە لایەنی مێژوویی رواڵەتی، بە رووداو و وەزیفە. لەبەرئەوە ئەم مێژووگەراییە، مێژووگەراییە: بەڕووی داهاتوودا ناکرێتەوە، بەڵکو بۆ رووداوەکانی رابردوو- بۆ رووی مێژوو، دەمانگەڕێنێتەوە.

کەوابوو شیعرە، کە مێژوو تیغ دەکات، وەچەی ئەوە، بەڵام تێدەپەڕێنێ. ئێمەش مێژوو بە شاکارە ئەفرێنراوەکان دەناسینەوە، وەک لەوەی ئەم کارانە بەو مێژووە بناسینەوە کە تیایدا ئەفرێنراوە. "گەلگامێش" و "ئۆدیسە" و شانۆی سۆفۆکلیس، لەو نموونانەن کە کارگەلێکن قۆناغە مێژووییەکانیان رۆشن دەکەنەوە، زۆر پتر لەوەی ئەو قۆناغانە رۆشنی دەکەنەوە.



## شیعر ژیانە

شیعرێک دەخوێنمەوە کە توینی بانگدەکات، ئیدی وا بە خەیاڵمدا دێت، کە ژیان کۆترە کێویلەییەکە و لە باڵێکیدا مەرگ ناشارێتەوە، تەنها لەبەر ئەوەی لە باڵەکەی تریدا ئەڤینی شاردووەتەوە. لە نێوان مەرگ کە بریتییە لە پیوار ـ الغیاب ـ لەلایەک و ئەڤینیش کە ئامادەییە، لەلایەکی ترەوە، ئەو قامیش، کە بە مرۆڤ ناویدەبەین دەلەرێتەوە. بەڵام لێرەدا قامیشێک هەیە بیرناکاتەوە، وەکو ئەوەی باسکال دەیزانێت، بەڵکو قامیشێکە مەست دەبێت، وەکو ئەوەی ـ النفری ـ دەیزانێت. ئەوەش بریتییە لە ماوەی شیعر: بیابانی بەرفراوان، گژوگیا و هاوکاتیش لەنێوان ئامادەیی و پیواریشدا خۆلێکی بێ کۆتایی درێژ دەبێتەوە.

کە وابوو شیعر چییە؟ بریتییە لەدیداری نائامادەیەک کە لەنێوان وشەکاندا نەبێت، نایبینین بەڵام لە زەمەنێکیتردا. رۆڵی شیعریش بریتییە لەوەی کە ئەو زەمەنەی تر دابمەزرێنێ.

شیعر هەیە، دەزووی ژیانی گرتووە و بەدوایدا دەڕوات: کە لەو کەمترە. شیعریش هەیە دەورەی دەدات، بۆ ئەوەی لە چرکەساتێکدا یەخسیری بکات، چونکە لەو زیاترە. هەر لەبەر ئەوەشە لە زەمەنیش زیاترە. مەبەستم لەوەیە کە بەردەوامی دەزووی ئاسۆیی ریزبەندی زەمەن دەپسێنێ و چرکە ساتێک دادەمەزرێنێ، کە تیایدا زەمەنەکان یەکتری دەبرَن. هەروەها چوونە نێو پێوانە و نەرێتەکان رەتدەکاتەوە و وەکو رەشەباش هەڵنایەت.

شیعر بەم واتایە، شوێنی مرۆڤە. بەمەش شیعر هەوڵدەدات بانگهێشتی توینی بکات، بۆ ئەوەی شوێنی تایبەت بەخۆی چێبکات. هەموو خواستەکان بۆ ئەم جۆرە دامەزراندنە، لەسەر ئەو کرۆکانە

دادەمەزرێن، کە لیوباردی شاعیر لەنێوان فۆرمە زۆرەکان و فۆرمی ساکاردا بۆمان ئاشکرا دەکات، کە دەڵێت: " مەرگ و ئەڤین دوانەیەکن".

شیعر لەیەک کاتدا ئەزموونی خۆشەویستییە کە هاتووە یان دێت، هەروەها ئەزموونی مردنیشە کە هاتووە یان دێت. خۆشەویستی دەست دەکات بەوەی کە مەرگ تەواوی نەکردووە و مەرگیش ئەوە تەواو دەکات، کە ئەڤین دەستی پێکردووە.

ئەڤین ناکۆتاییە و ناشکرێت بگاتە ناکۆتایی. لەبەر ئەوە مردن وەکو پێویستییەک دێتە ناوەوە، نەک وەکو پێویستی رزگاربوون لە بوون، بەڵکو رزگاربوون لەوەی بوون سنووردار دەکات. مرۆڤ بێ ئەنجام لە سنووری خۆیدا هەوڵدەدات لەو سنوورە دەربازی بێت، کە جیهان بەسەر ئەڤین دا دەیسەلمێنێ، لەبەر ئەوە پێویستە لە سەری کە بۆ دەرەوەی سنوور بازبدات. بەڵام ئەم بازدانە، مەبەستم لەم مردنە، مردنی ئەڤین نییە. بەڵکو مردنی هەموو ئەوەیە، کە لێک دژیەتی. هەروەها گواستنەوەش نییە لە چرکە ساتێکەوە بۆ ئەبەدییەت، بەڵکو بە ئەبەدیکردنی چرکە ساتە. ئەمە ئەو هاوارەیە کە هەموو ئاشقێک دەیکات:" ئەی زەمەن رابوەستە". ئاشق نامرێت بۆ ئەوەی بەکردەوە بمرێت، بەڵکو دەمرێت بۆ ئەوەی ئەو جیهانە بمرێت کە بەبێ ئەڤین دەگۆڕێ.

چرکە ساتیش شیعری هەموو نەناسراوێکمان بۆ ئاشکرا دەکات و لەم ئاشکرا کردنەشدا خۆیمان بە نەناسراوی کە بە بەردەوامی لە دایک دەبێت، بۆ بەجێدەهێڵێت. چرکە ساتیش لە ناخماندا ئەو هەستە دەخولقێنێ کە بە تەواوەتی دەستمان بەسەر ژیاندا گرتووە، هەروەها هەستی پێچەوانە دەخولقێنی کە ژیانی راستەقینە دەستی پێنەکردووە. هەروەها شیعریش ئەو باڵندەیەیە کە لە باڵێکدا کۆتایی و لە باڵەکەی تریشیدا ناکۆتایی هەڵگرتووە.



## وێنە

جەستەیەکم نەبینیوە کە خوێن بپۆشێت. لەگەڵیشیدا هاوڕێ نەبووم کە دەچێتە ژێر گڵەوە. بە تەنیا وێنەیە کە "ئاسۆ"ی پڕ کردووم. ئەوەتا ئەمێستاش لەگەڵمدا دانیشتووە و دەپەیڤین و بەیادمان دەهێنینەوە.

***

لە چیای کەریمەوە هاتین و جگە لە هەژاری چیتر هاوڕێمان نەبوو. بەڵام هەژاری، وەکو با هەنگاو دەنێت: بە دەستێکی زەمەن رام دەکات و بە دەستی دووەمیشی تووڕەیی ئاشق هەڵدەگرێت.

لە رێگاماندا و، لە نێوانماندا دەستی، وەکو ئەوەی بە هەڵسان کرد بۆ کێبڕکێ کردنی خۆشەویست، وەکو ئەوەی گەمەی دوانەیەک بێت: ئاخۆ کامیان زیاتر لەو پێشبڕکێ پڕ کێشمەکێشەدا بەرگە دەگرێت و کامیشیان ئامادەیە بە پیر ئەو دەنگەوە بچێت کە بانگیان دەکات؟

هەریەک لە ئێمە شتێکی لەبارەی ئەو مردنەوە زانیوە کە لە وڵاتدا بە خەباتی سیاسی ناودەبرێت. دیسان لە نێوان ئەو وڵاتانەشدایە کە دەکرێت مێژووی بە پارچەکانی جەستە بنووسرێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێک چێژی لەو خۆشییە وەرگرتووە کە دزەی کردووەتە ئەو مردنەوە.

***

هەرەیەک لە ئێمە لەو رۆشناییە دەگەڕێت کە درەوشاندنەوەکەی زۆرترە. لە دامەزراندنی ئەو پەردەدا کاری دەکرد کە کەنگەلان دەسڕێتەوە و، هۆگری لەنێوان زام و برینداربوون دا دروست دەکات. بەڵام هەریەک لە ئێمە جگە لەمردن هیچی نەبینیەوە، موشەکێک لە

رووی‌دا: بوەستە، کە مەمکەکانی ببڕدرێتەوە. وەکو پیرەژن گرمۆڵە ببێت و بە دار و چیلکەی شکست و غەمەکانی خۆی گەرم بکاتەوە. ببێتە خۆڵەمێش و ماڵئاوایی.

***

ئەوە وێنەکەیەتی لەگەڵمادا ئەمێستا دادەنیشێ، دەپیڤین و بە یادی خۆمانی دەهێنینەوە.

–چی بکەین، ئەم ئێوارەیە؟ بەیەکگەیشتن هەنگاوەکانی سڕییەوە. خۆشی هەنگاوەکانە و دەسڕدرێتەوە.

– کەوابوو کێ بەخێرهێنانی ژیانی شاردراوەی ناو ژیان دەکات؟ بەم زەمەنەی کە لەژێر زەمەندا ئامادەی دەکەین؟

کێ ئاهەنگ بۆ ئەو بلێسەی دەرکەوتووی خەونەکانی خۆی دەگێرێت؟ چۆن دوادەست لێدانمان لە سەر کەڤاڵی سەرگەرمی دابنێین؟

***

لە ڕێگاماندا، لە ماوەیەکدا، دەستمان کرد بە دوورکەوتنەوە، وەکو دوورکەوتنەوەی دوانەیەک. من بەلای دردۆنگی یەکانمدا دابڕام، بۆ بڵاوکردنەوەی لە نووسین دا. بەڵام ئەو هێرشەکانی بۆ سەر کارکردن زیادی کرد. ئەو شاعیر نەبوو، بۆن و بەرامی شیعر لە بۆن و بەرامی مومارەسە جیادەکاتەوە. شاعیری ژیان، مومارەسەی شیعری ژیان دەکات.

دەست بە هەڵکوتاندن دەکات و نەبەزی دەنوێنێت، وەکو ئەوەی سوارچاکی، لە ناوەکانی بێت. یاخود شتێکە لە شتە دەستەمۆکانی. من لە دوورە یان کاتێک پێیدەگەیشتم، هەستم بەوە دەکرد، کە لە هەر



کاتێک زیاتر متمانەی بە خۆی هەبوو، بە قوڵییەکی جوانتر دەیڕوانی و لە پێناویدا کاری دەکرد.

کاتێک سوسەی بارودۆخیم دەکرد، وا بە خەیاڵمدا دەهات، ڕەنگە کە مرۆڤ بەڕاستی بۆ کانیاو ئاوەژوو بێت: بۆ دڵنیا بوونیش لێیدەڕوانم ـ دەبینم هەڵدەقوولێت، فیچقە دەکات یاخود ئاوی تێدەچێت و، خۆی بەسەر نەخشەی وڵاتەکەیدا دابەش کردووە.

***

ئەوە وێنەکەیەتی، لەگەڵمدا ئەمێستا دادەنیشێ، دەپەیڤین و بە یادی خۆمانی دەهێنینەوە.

– وەکو تۆ دەزانم کە ئەو زۆر لەسەر خۆڵەمیش نوستووە، بۆ ئەوەی ژیلەمۆ ئامادە بکات. وەکو تۆ دەزانم کە زۆر خۆی بە پوش و پەڵاش داپۆشیوە، تا وەکو گوڵە گەنمەکان ناکاو گیر بکات.

بەڵام، ئا ئەوە تا، خۆڵەمێش هێشتا وەکو پۆشاکی زەمین وایە و، خەریکە دەڵێم: خۆر ئەسپی خۆی زین دەکات، دامێنەکانی لە خۆڵدایە، ڕێگاش هەر ڕێگایە. ڕۆشناییەکیش نییە بدرەشێتەوە. شوێن پاشماکی بایە، زەمەنیش سرووتی بە خاک سپاردنە.

– نەخێر. فەزا هەور دایدەگرێ بۆ ئەوەناستەم بکات، بەڵکو بۆ ئەوەی ماڵەکەی پرسۆزتر بێت بۆ خۆر. نەخێر، ئیتر بە ڕۆشنایی دەڵێم مرەکەبی هەنگاوەکانم بێت و هەمیشە هاوار دەکەم: ئەی مرەکەب ئاوێزانی هەناوم بە.

***

تۆ کێیت کە هێشتا لە شەقامەکەدا دەپەڕیتەوە، ئاخۆ تۆ بەڕاستی خاوەنی هەنگاوەکانیت؟ دەممان لەخوێن ناوە و بۆی ناجوڵێین. ئەم تایەمان لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ لە شەپۆلی تەمەکاندا مەلە

دەکـەیـن، وەکـو ئـەوەی تـەختـەی سـەر ئـاو کـەوتووبێـت: ئـەم گۆتبوونەمان لە کۆێوە هاتووە.

***

ئەی خۆری دەرکەوتووی نێو خوێن، ئایا دڵانی مرۆڤی وڵاتەکەم رۆشن ناکەیتەوە؟

ئەوە وێنەکەیەتی. لە مەرگدا وێنە و واتا یەکدەگرن. ئایا وێنە لە چاوەکانتدا هەیە، ئایا واتا لە دەروونتدایە؟ کەوابوو، مردن نییە، بەڵکو مردن ناوێکی تری ژیانە.

***

موته يزورني حيث أنا
لا أقدر أن أنهض لاستقباله
تنهج صورته. تبتسم، تفتح ذراعيها وتهمس : اهلاً

***



## شیعر و کفر

١- لەم تیلماسکە ـ پارچە کاغەزە لە " گۆڤاری العربیە" کە لە شانشینی سعودیە دەردەچێت ( ژمارە٩١، ئایاری ١٩٨٥) کە خوێنەریش وێنەی نموونەیەکی دەبینێ، رەخنەی ئایینی فیکریی ـ ئەدەبی رەسەن ئامێزی نێو کۆمەڵگەی عەرەبی پێشکەش دەکات. کە بە هەر هۆیەک بێت لەمڕۆدا زیاتر بڵاوبووەتەوە.

لێرەدا مەسەلەکە پەیوەستە بە رەخنەی شیعر. ئەم بە کفر و گومڕایی حوکمی خۆی دەدات بە سەر هاوڕێی شاعیر ـ دکتۆر عەبدولعەزیز ئەلمقالح دا. بەپشت بەستن بە خوێندنەوەی یەکێک لە قەسیدەکانی: بەڵێ کفر و گومڕایی زۆر بە سادەیی، چەشنی هەناسەدانی هەوا و خواردنەوەی ئاو! دەڵێم: خوێندنەوە، چونکە بەشێوەیەکی تەواو پێچەوانەیە لەگەڵ سروشتی خوێندنەوە کە شیعری دەیسەپێنێ چونکە ئەم زمانە مەجازییە. کەوابوو ئەوەی دەیگوازێتەوە ناچێتە کایەی (رەوا ـ الحق) یان (ناڕەوا ـ باطل) ـ یاخود شێخانەییە و پەیوەستە بە خەیاڵ بردنەوە و سیمبولەوە.

هەروەها متمانە پێکراویش نییە کە پەیوەست بێت بە باوەڕگە و ئایینزاکان.

بۆ نموونە، کاتێک شاعیر دەڵێت" خودا بووەتە خۆڵەمێش" مەبەستی لە مەدلوولی راستەوخۆی ( دیار – الظاهر) نییە، واتە

مەبەستی لەو خودایەی کە موسڵمان باوەڕی پێیەتی و بووبێت بە خۆڵەمێش، نییە. هەروەها بۆ نموونە ئایەتی پیرۆزی " الرحمن علی العرش استوی"، مەدلولی وشە ناگەیەنێت، بەوەی کە خودا عەرشێکی ماتریالی هەیە و لەسەری دانیشتووە. وەکو ئەوەی خاوەن عەرەشەکان لەسەری دادەنیشن.

لێرەدا شاعیر بە وتەکەی ئاماژە دەکات بە حاڵەتێکی گشتی لە پاشەکشە کردن یان پیواری بیرۆکەی خوداوەند تەنیا و ئەو بەهایانەی کە لە خۆی گرتووە و ئەو رەفتارانەی کە گریمانەی بۆ دەکات.

بەڵکو بە پێچەوانەوەیە، ئەم حاڵەتە رەخنەی لێدەگرێت کە خۆی لە مومارەسەی ئایینی باودا دەبینێتەوە و بەوەش بیرۆکەی خوداوەندی بالاڕۆیوو بێ بەها دەکات و دەیشێوێنێت، بەمجۆرە وادەردەکەوێت کە خوداوەند لە ریگەی ئەم مومارەسەیەوە بووبێتە خۆڵەمێش. لێرەدا شاعیر باوەڕدارە بە خوداوەند لە جوانترین فۆڕمی باوەڕداریدا. بەمجۆرە ئەو خوێندنەوەیەی کە ئەم گۆڤارە پێهەڵساوە ئەم پارادۆکسە ئاشکرا دەکات: گومڕا و کافر ئەوەیە کە باوەڕی بە خودایە و، گەورەکردنیەتی لە پای مومارەسەی بێبەها کردن و شێواندنی وێنەی خوداوەندا!

٢- بەر لەو ئایینانەی کە باس لە تاکوتەرایی خوداوەند دەکات، مرۆڤ ئەو بتانەی دەپاراست کە بۆ خۆی کردبوونە خوداوەند، چونکە بت بەو وەسفەی ماتریالە، بدزرێت یان بشکێنرێت. لەبەر ئەوە ئەوەی باوەڕی پێیهەبوو بەرگری لێدەکرد و دەیپاراست. بەڵام لە تاکو تەراییدا، خوداوەند پارێزەری گشتە و پێویستی بەکەس نییە



پارێزگاری لێبکات. ئەوەی کە پێویستی بە پارێزگاری لێکردنە مرۆڤی موسڵمان خۆیەتی.

ئیدی خاوەندارانی " گۆڤاری العربیە" و دەستە خوشکە موسڵمانەکانی چیدەکەن لەم مرۆڤە؟ چی پێشکەش بە موسڵمانی چەوساوە دەکەن، دەربەدەر، بەندکراو، هەژار، نەخوێنەوار، نەخۆش؟ چی دەکەن بۆ ئازارکردنی موسڵمان لە بەکارهێنانی دەرەکیدا، کە سامانی بە تالان دەبات و وزەکانی ئیفلیج دەکات، لە ستەمکاری ناوخۆیدا کە زیندوویێتی تێکدەشکێنێ و بەڕوویدا دەرگاکانی هیوای پێشکەوتن و ژیانی ئازاد و بەخشندە و میهرەبان دادەخات؟

چالاکییان لەسەر بەرەنگاریبوونەوەی باوەڕدارانی راستەقینە راوەستاوە، بە ناوی پارێزگاریکردنیان لە ئایین، قێزەونترین بەدکاری مومارەسە دەکەن و رووناهی خوداوەندێتی دەشارنەوە.

ئەوان ئیسلام و موسڵمانان لەو دەسەڵاتەی کە هەیە کورتدەکەنەوە، ئەو دەسەڵاتەی کە خۆشی " ئیسلامییەت" یان بەسەردا دادەکات. ئەوان " مامۆستا" و "پەروەردەکار"ن، کە لە لایەن ئەم دەسەڵاتەوە بەکاردەبرێن بۆ پەروەردەکردنی موسڵمانان و رۆشنبیرکردنیان! موسڵمانان لە دیدی دەسەڵات و دام و دەزگا و نووسەرانی، لەحاڵەتی هەمیشەیی " منداڵیدان". هەر بۆیە پێویستی بەردەوامیان بە "چاودێری" و "پەروەردە" هەیە - بۆ ئەوەی فێربن کە چۆن و چی دەنووسن، چۆن و بە چییەوە بیردەکەنەوە؟ بەڵاش بۆ ئەوەی ئەم "پەروەردە"یە رەتدەکاتەوە یان لێیهەڵدێت.

هەر بۆیە کفر و گومڕایی: سادەترین پلەیە لە کەنگەڵانی ئەو ئەشکەنجەدانەی کە چاوەڕێی دەکات.

٣- لە درێژەی قسەکاندا، تیلماسک لە " گۆڤاری العربیە" دا، رەخنەی ئەدەبی تەقلیدیمان بە بیر دەهێنێتەوە، کە هێشتا لە هەندێ لە ناوەندە ئایینی و فێرکاری و ـ پەروەردەییەکاندا باوە. خاوەنەکانی ئەم رەخنەیە وا لە زمان دەڕوانن بەو وەسفەی تەنیا ئامرازی بەیەکگەیشتنە. ئەگەر ئەم دیدە لە کۆنتێکستی ئاخاوتن دا بەسەر گۆڤاری ژیانی رۆژانەییدا دروست بێت، ئەوا هەرگیز لە کۆنتێکستی ئاخاوتن بەسەر گوتاری ئەفراندنێتی دا دروست نییە.

دوورتر دەرۆم و دەبێژم کە هەژموونی ئەو گوتەزایەی کەوا دەبینێ، زمان تەنیا ئامرازی بەیەکگەیشتنە، ئەوە هۆیەکی سەرەکییە لە هۆکارەکانی بێتواناکردنی زمانی عەرەبی لەلایەک و هۆکارەکانی تەنگەژەی ئەفراندنگەرایی نێو کۆمەڵگەی عەرەبی لەلایەکیترەوە.

زمان زیاترە لەوەی ئامرازبێت. رەهەندێکی دامەزرێنەرە لەو رەهەندانەی کە تیایدا شوناسی کۆمەڵگە دەجولێت و فۆرمەڵە دەبێت. لەوانەیە لە روویەکەوە رەهەندی یەکەم بێت. چونکە مرۆڤ بەو وەسفەی بیرکەرەوە و شاعیرە، زمان وەکو ئەوەی مرۆڤی ئاسایی لە چالاکی رۆژانەیدا بەکاری دەهێنێ، ئەو بەکاری ناهێنێ. چونکە لە بناغەیدا ئەو لە زمان پێکهاتووە: زمان بۆ خۆی مرۆڤی شاعیر و بیرمەندە، زمان بۆ خۆی فیکری ـ چاودێر و کارکەرە.

بوونی زمان بە تەنیا کە ئامرازێکی بەیەکگەیشتن بێت، واتە لە خۆیدا هیچ جیاکارییەکی نییە و شیاوی گۆڕینە بە شێوەی ئامراز. بە گوێرەی ئەم دیدە ئەوەی گرنگە، پێکگەیشتنە نەک زمان. لێرەدا بەتەواوەتی زمان لە ئاستی هەردوو لێودایە، هەروەکو چۆن ئامێر لە ئاستی هەردوو دەستدایە. هەروەها ماکی پەیوەندی بە چییەتی مرۆڤ و شوناسەکەیەوە نییە.



لەم بارەدا زمان، کە بە تایبەتیش لە کایەی نووسینی ئەفرێنراودا بەدەردەکەوێت، هەروەها بەتەنیا پاڵپشتی خودی ئەفرێنەر نییە بەو وەسفەی ئامرازێکە لەدەرەوەڕا، بەڵکو وزەیەکە ـ بەشێکی جەوهەرییە لە جوڵەگەرایی ئەفراندن و کاری ئەفراندن.

هەژموونگەرایی ئەو دیدەی کە لە چوارچێوەی کایەی ئەفراندنی شیعریدا پێیوایە، کە زمان تەنیا ئامرازە، بووەتە هۆی سوێندخواردنی " تایبەت" لەشیعردا، بە پلەی یەکەم، هەروەها رەخنەی شیعری بووەتە جۆرێک لە دادگاییکردنی " ئەخلاقییەت": ئایا قەسیدە سەرپێچی " یاسا". رەسەنایەتییەکان، نەریتەکان، بەهاکان... دەکات یان نا؟ پاشان بووەتە هۆی ئەوی کە ئەم رەخنەیە پێداگری لە سەر "سوودمەندی" لە شیعردا بکات، تەنانەت داوای چێژ لە شیعر دەکات کە بەشێوەیەکی ئۆرگانی بە سوودمەندییەوە پەیوەستە. ئەم جۆرەش لە "سوودمەندی" وادەخوازێت کە داوا لە شاعیر بکات "ئێش و ئازارەکانی" روون بێت لەڕووی دیاری گۆیدا و، دوورکەوتنەوە لە هەموو ئەوەی کە رەنگە خوێنەر یان بیسەر نیگەران بکات و رووبەڕووی شتگەلێکی بکاتەوە کە نایانناسێت، کە ئەمەش دەبێتە ئەوەی ئەو پرسیارانەی لێبکات کە نازانێت وەڵامیان بداتەوە. ئەم رەخنەیەش بە تەواوەتی ئەوە فەرامۆش یان پشتگیوێ دەخات، کە شیعر "سوودمەند"ە بۆ خۆی، بەو وەسفەی چالاکییەکی مرۆیی خوڵقێنەرە، ئەوەش لەبەر ئەوەنییە کە "خزمەت" بە ئامانجی "سوودمەندێتی" دەکات، یا خود هەڵگری "واتا"ی سوودمەندە. چونکە شیعر سوودمەند نییە بەو پێیەی وەسیلە بێت، بەڵکو بە سروشتی خۆی سوودمەندە وەکو ئەوەی کە خۆی هەیە. بۆ نموونە، عاشق یان برسی یان شۆڕشگێڕ، شیعر نانووسێت بۆ ئەوەی "خزمەت بکات" یان "سوودی هەبێت" بۆ ئەڤینداران یان برسییەکان

یان شۆڕشگێڕەکان، بەڵکو شیعری درێژ کراوەیە یان وێنەیە یان فۆڕمێکە بە زمان بۆ ئەزموونی عشق یان برسێتی یان شۆڕش. ئەمە بەرەو ئەوەمان دەبات کە بێژین، ئامادەیی شیعر پەیوەستە بە ئامادەیی خوێنەرانی: خوێنەر خولقێنەرێکیترە، کە لە ناوەوەڕای شیعر نەک لە دەرەوەڕای نزیک دەبێتەوە، بەو وەسفەی بزوتنەوەی ئاشکراکردنی جیهان و مرۆڤە، نەک بەو وەسفەی "دەفر" بێت و بە خۆراکێک پڕبکرێتەوە. ئەمەش واتای ئەوەیە، ئەو خوێندنەوەیەی کە دەقی شیعری لە تۆڕی "سوودمەند"یدا نەبێت نایبینێت، ئەوا دەیشارێتەوە و دەیشێوێنێت. چونکە هونەر و وێژەکان تایبەتمەندییان لەوەدایە کە دەبێ لە خۆیدا تەماشا بکرێت و خۆبەدەست ئەفسوونی خەیاڵبردنەوەیی و جوڵەگەرایی خولقێنەرییەوە بدرێت. لەمەشدا بە تایبەتی، خوێنەر خۆراکی پێدەدرێت و هەست و خەیاڵەکانی بۆ جیهانێکی.... جوداواز دەگوازێتەوە و تیایدا دەبزوێت و تازە دەبێتەوە، ئەمەش هەر بەتەنیا بە "هزر"ی نا، بەڵکو بە تەواوی قەوارەی. بە تایبەتیش کە دەقی شیعری دامەزراندنی وێنە و ئەندێشەکانە نەک دامەزراندنی "ئایدیا" و "ئێدەکان". لەمەشدا لە رەخنەی تەقلیدی بە هەردوو رووی "ئایدیال"ی و "ماتریال"ی دەرماندەکات. کە هەردووکیان دوودیدی یەک دراون. راستی ئەمیان "ناڕاستی" ئەویانە و "ناڕاستی" ئەمیشیان " راستی" ئەویانە. هەریەکێکیان لە دەقی شیعریدا لە "راستی" یان لە"ناڕاستی" دەگەڕێت. واتە لە شتێک کە لە دەقدا نییە، بەڵکو لە خۆیاندایە. بەمجۆرە هەردووکیان شیعر رەتدەکەنەوە، بۆ ئەوەی هەریەکەیان بانگەوازی خۆی بچەسپێنێت.

دەقی شیعری سیمبول و پەیوەندی سیمبولگەراییە و، "راستی" و "ناڕاستی" نییە، بەڵکو " دەلالەت" و "ئەگەرەکانە" کە توانستی تازە بۆ پرسین پێشکەش دەکات. لەمەشدا بە تایبەتی هەردوو ئەم رەخنەیە "بێزار" دەبن: هەریەک لەمانە پشت بە یەقینێکی پێش وەخت دەبەستێت، کە بەوپێیەش "ئەگەر گەلەکان"ی تر بۆ پرسین لە ئارادا نییە، چونکە "وەڵامەکان" هەموویان لەبارەی هەموو گرفتەکانەوە، پێش وەخت لە خۆیاندا هەبوونیان هەیە. لەبەر ئەوە ئەوەی کە لە واندا نەبێت جگە لە بەدحالیبوون یان هەڵە، چیتر نییە. لێرەوە رەهەندی رەخنەیی لە ئەفراندنی شیعردا سەر هەڵدەدات و پرسیار تازە دەکاتەوە و ئەو کەم و کۆڕییانە ئاشکرا دەکات، کە لە راستییە لە ئارادابووەکاندا هەیە و ئاماژەش بە ئەگەرەکانی تری راستییەکانی دی دەکات. لێرەوە بانگەوازمان دووبارە دەکەینەوە کە عەرەب بگەڕێنەوە بۆ "چاکە"ی یەکەمیان: شیعر و زمانیان ــ لە تایبەتمەندێتی ئەفراندنگەرایی و بلیمەتیدا.

## تیلماسکە دەق _ نص القصاصة

"چۆن شاعیرێکی موسڵمان ئەم قەسیدەیە دەڵێت؟

* خوێنەرێکی بە پەرۆش، قەسیدەیەکی بۆ ناردووین کە لە یەکێک لە " گۆڤارەکان"ی دەوڵەتێکی عەرەبی دەردەچێت، کە شیعری شاعیر، دکتۆر " عبدالعزیز المقالح"ە. چەند بە ئازار بووین کە بینیمان لەم قەسیدەیەدا برگەی گومڕایی و کفر و گاڵتە پێکردن بە خودی خوداوەندی تێدایە... نموونەی ئەم شتانە لەلای شاعیرێکی عەرەبی موسڵمانەوە... دەردەچێت... لەم قەسیدەیەدا و بە هۆی ئەوەی کە تیایدا هاتووە، دڵ بەر لە چاو خوێن دادەچۆڕێنێ. بۆ ئەوەی لەم شاعیرەش کەللەیی نەبین، هەندێ وشە و برگە لە قەسیدەکەی دەهێنینەوە و ـ داوای بەخشینیش لە خودا دەکەین لە پای هەموو ئەوەی کە تیایدا هاتووە.

صار الله رماد
صمتاً
رعباً فی کفِّ الجلاّدین
حقلاً ینبت سجات و عمائم
بین الأبِّ الیغنیه الثروة
وبین الربِّ القادم من ( هولیود)
هەروەها تیایدا دەڵێت:
"کان الله قدیماً. ثم کان سحابه



کان نهاراً فی لیل
أغنیه تغسل بلا مطار الخضراء تجاعید الأرض"

* ئەمە هەندێکە لەوەی لەم قەسیدە کافرەڕا.... هەیە، ئێمەش بە هیواین بە هەڵە ئەم قەسیدەیە درابێتە پاڵ (المقالح)ی شاعیر... جێگەی سەرسوڕمان نییە، کە ئەم قەسیدەیە لە گومڕایەکی کافرەوە بێت، وەڵی هاتنی لەلای شاعیرێکی عەرەبی موسڵمانە، وا لە زامەکانمان دەکات بە سوێ بێت.. هاتنی ئەم قەسیدەیە لە کاتێکدایە، کە ئێمە پێویستمان بە خودا و باوەڕبوونە پێی بۆ ئەوەی بە سەر دوژمنەکانماندا سەرمانبخات و... قودسمان بگەڕێنینەوە... ئابڕوی زامدارمان بگەڕێنینەوە ئیتر لە توانجداندا چ بڵێین.. پرسەکە لەهەر توانجدانێک گەورەترە و، بۆ جارێکی تریش بە هیواین کە ئەم قەسیدەیە لەلایەن شاعیرێکی عەرەبی موسڵمانەوە دەرنەچووبێت.

"بالآیی خودا بالآتر و گەورەترە لەوەی کە دەیڵێن".
" گۆڤاری العربیه"
(ژمارە ٩١ ئایاری ١٩٨٥)

# ئاماژەکان

* سەرەتا لە نێوان دوورخراوەکاندا: دەقێکە کە بەتایبەت نووسراوە، بۆ خوێندنەوەی لە " پینیالی هەژدەیەمینی نێودەوڵەتی بۆ شیعر" (بەلژیکا، لییج ٣-٧ی ئەیلولی ١٩٩٢).

* دەقی قورئان و ئاسۆکانی نووسین:

دەقێکی عەرەبییە بۆ ئەو لێکچەرەی کە لە کۆلێژی دو فرانس لە سەر بانگهێشتی ئیڤ بونفۆای مامۆستای کورسی شیعر لە چوارچێوەی وانەکانی لەمەڕ مالارمیە، بە فەرەنسی وتمەوە، ئەویش لە ٣ی شوباتی ١٩٩٢. کە ئەدرێسە ئەسلییەکەی: دەقی قورئانی: نووسین نە شیعر و نە پەخشانیشە.

* " شیعر و رۆشنبیریی نا شیعری": لێکۆلینەوەکە لەو کۆڕەدا پێشکەش کراوە، کە ئەکادیمییای سویدی لە ستۆکهۆڵم لە کانوونی یەکەمی ١٩٩١ رێکخستبوو لەبارەی "ئەدەبی دژوار"ەوە.

منیش ئاخاوتنم لەبارەی ئەم ئەدەبەوە هەڵبژارد، ئەویش لە روانگەی ئەزموونی کەسێتی تایبەتیم لە کۆمەڵگەی عەرەبی و لە چوارچێوەی رۆشنبیری عەرەبیدا، هەروەها قسەکانیشم لە شیعردا چڕ کردەوە، چونکە پێم وایە ئەمیان رۆشنترە و لە تێگەیشتنیش لە کێشە و گرفتەکان کە نووسینی شیعریی لە جیهانی ئەمڕۆدا دووچاری دەبێتەوە، بەشداری دەکات.

* "داهاتووی شیعر/ شیعری داهاتوو": دەقی ئەو پەیڤەیە کە لەو کۆڕەی"پەیمانگای هونەرە هاوچەرخەکان" لە حوزەیرانی ١٩٩٢ لە لەندەن لە بارەی داهاتووی شیعرەوە سازیکردبوو، خوێندمەوە. لە کۆڕەکەدا، جۆزیف برودسکی (خەلاتی نۆبڵ،١٩٨٧)، فیلوش (نۆبڵ،



١٩٨٠) دیریک و ولکوت، شاعیری کاریبی (نۆبڵ، ١٩٩٢) بەشدار بوون.

* "مرۆڤ بێ شوێنە" هەڤپەیڤینێکە لە"لسان الحال"دا، بەیروت ٧ی کانونی یەکەمی١٩٦٧ بڵاوبووەوە.

*" سلاو"، پێشەکی پەرتووکێکی هونەریی تایبەت بە (ضیاء العزاوی)" یە، تحیە للجواهری. (لەندەن، ١٩٨٩).

* راوەستابوو، کاتیش پارساییەکە و تێدەپەڕێ: گفتگۆیەکە و لە رۆژنامەی "الثورە" (دیمەشق، ١٩٧٧/٧/٢) دەرکەوت.

* درۆ/ راستگۆیی:( "لسان الحال" بەیروت ١٤ی ئابی ١٩٦٦).

* ئەلسەبیاب، پاش نیو سەدە لە دایکبوونی: رۆژنامەی" الثورە" دیمەشق،١٩٧٦.

* "وێنە": سلاو بۆ هاوڕێی شاعیر کەمال خیر بەگ.

* " شیعر و کفر": لە گۆڤاری "الکفاح العربی"، بەیروت، ١٩٨٥ بڵاوبووەتەوە.

# برایانی شیعر

١- بۆ جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٥٧ دا بینیم، کە ئەوەش دیدارێکی کورت خایەن بوو. وتووێژەکەمان ئاوێزانێک بوو لە یەکتر ناسی و گۆڕینەوەی راوبۆچوون لەبارەی شیعرەوە. لە کاتی وتووێژدا هەوڵمدا خوێندنەوەم بۆ شیعرەکانی بەبیرم بهێنمەوە و بەراوردکاری بکەم لە نێوان ئەو کەسەی کە لە خەیاڵمدا بووە و ئەو کەسەی کە لەگەڵیدا دەدوێم.

لە نیگا و لەدەنگیدا، وایلێکردم کە پتر بەم نهێنییەوە پەیوەست ببم، کە لە کەسێکدا کۆبووەتەوە لە نێوان دڵتەنگی دڵ و خۆشی ئەقلیدا. ئامادەبوونی بە لامەوە چەشنی گولێکی گەشاوە بوو، کاتێک بە چاوی جەستە لێیدەڕوانیت، بەڵام ئەو کاتەی بە چاوی زرنگی تێیڕادەمێنیّ پەشەهوردەیی دەبینی کە سەرقاڵی کردووە. ئامادەیی چەشنی ئەستێرەیەکە لە خەم، کە لە خولگەی تکاکاری فیکر و گەشبینی ئیرادە دەسوڕێتەوە.

٢- وا بۆم رێنەکەوتووە کە لە ژیانی کەسایەتی زۆر بزانم، بەڵام بەلای منەوە وەکو شاعیرێک ماوەتەوە کە لەو جیهانە نهێنی و تاریکەدا گەشە دەکات و دەبزوێت کە لە ناو جیهانی دیاری راستەوخۆدایە و برایانی شیعر ( أخوه الشعر) نیگاری دەکێشێت.

ئەو پەیوەندییەی نێوان ژیان و شیعری، هەر ئەوە کە پەیوەندی لەگەڵ ئەوانیتردا رۆشندەکاتەوە. ئەوە شیعر بووە کە سنگی بۆ ئەویتر دەکاتەوە و دەستی لە میتای سیاسەتەکاندا بۆ درێژ دەکات.



شیعر هەر بە تەنیا هونەرنییە لە هاوڕێیەتی لەگەڵ وشەدا، بەڵکو هونەریشە لە هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەوانیتردا.

٣- "بارە دەروونییەکان" بەم شێوەیە شیعرەکانی وەسف دەکات ئامۆژگاری دەروون ـ ئاوێنەی وشە و شتەکان، کە پێناچێت بە شیعر هێوربێتەوە بۆ ئەوەی نائارام بێت و پێشناچێت نائارام بێت بۆ ئەوەی هێوربێتەوە ـ ئەوەی دەگۆڕێت شاعیرە، کە دیدیش بۆ شتەکانی دەورووبەری ئاوەژوو دەکات و لەم "خۆش گیرییەدا" شیعرەکانی دەگۆڕێت، کە وادیارە لەبەر خێرایی لەناوچوونی چەشنی " دڵتەنگی-یە"، لەم "دڵتەنگی" یەشدا، کە وادیارە لەبەر گوڕی ئەو ئومێدە شاردراوەیەی و دواوەی، چەشنی "خۆشگیرییە".

نە هەناسە ساردی و نە هیواش، بەڵکو ئەو گەڕانەی کە لە نێوانیاندا ئەنجامی دەدات. ئەو گەڕانەش دڵسازی دەکات. ئەقڵ شیکارییە، کە وابوو ئەقڵ شیدەکاتەوە، دەڕوات تا ئەوکاتەی دێتە بەردەمی: تاریکی. دڵ، بەپێچەوانەوە، تیغ دەکات ـ بە هێز، لێدانی خۆی، بە سروشتیی خۆی و بە زەرورەت، دیسان رووناکایش دەبینێت، ئەگەر دوور و گرانیش بێت. دڵ نەک ئەقڵ، دەستمان دەگرێت و لە تاریکایی جیهاندا رۆشنمان دەکاتەوە، کە وابوو ئەم (بارە دەروونییانە "بارەکانی دڵە"و، شیعریشی بریتییە لە نووسینی ئەم حاڵەتانە: گەشتکردن تیایدا و پیایدا و لە میانەیەوە.

٤- لەو کاتەوەی شیعرەکانیم خوێندۆتەوە، بەبێ هیچ دردۆنگییەکی ئایدیۆلۆژیای خوێندۆمنەتەوە.

بە واتای وشە، وەکو شیعر خوێندۆمنەتەوە چونکە شیعرە بۆ شیعر ـ مەبەستم بۆ مرۆڤە بەر لەوەی بۆ چوارچێوە یان مەبەستێک بێت. شاعیریش لێرەدا لە ناو خۆیدا نیشتەجێبووە، دراوسێی ئەم نوکە سەیرەی مێژوو و شتەکانیەتی، لە ناخی نهێنی و خەمەکاندایە. لە دەرەوەڕا واتا ناهێنێ بەڵکو لە ناوەوەڕا. ئەو دەزانێت کە جیهان دەڕوات و لەسەر ئەدگارشیی دەمامکێک لە تراویلکە هەیە. ئیدی بۆ چی چوونە نێو ئەو کاروانە؟ ئەمێستاش جگە لە دیمەنێک کە هاوشێوەی وەهمە و لە ناو جەنگەڵەکانی "توتڕکی کڵپە سەندوو"ی بێ کوتایی کە درێژ دەبێتەوە، چیتر نییە.

شاعیر دەتوانێت لە دژی ئەم تاریکاییە زەبەندە چی بکات؟ خۆر بانگ دەکات و هەوڵدەدات ئەدگاری کازیوە بکێشێ و، دەڵێت، ئەو ڕۆشناییەی کە ڕووناکمان دەکاتەوە لە ڕێگایدایە بۆلامان، وا خەریکە دەگات، لەم تاریکایە خۆیدا هەڵدێت. ئا ئەوەش شیعرەکەیەتی، کە هێشتا پێم وایە لە شوناسی یەکەمیندایە کە تیایدا بووە: چەشنی لاپەڕەیەکە لە ڕۆشنایی چنراو بە دەزووەکانی شەو یان چەشنی لاپەڕەیەکە لە شەوی چنراو بە دەزووەکانی ڕۆشنایی.

٥- لەمەدا پێدەچێت شرۆڤەی خەمی شاراوەی شیعری بکات. ڕەنگە خەم لەو هەستکردنە دێرینەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستمانەوە سەرچاوەی گرتبێت کە هەستکردنە بە نەبوون ـ العدم ـ و ئەوەی کە هەموو شتێک بەفیڕۆ چوونە.

لێرەدا قەسیدەش جگە لە تاراوگە لە ناو ئەم حاڵەتە لە هەستکردن چیتر نییە، بەجۆرێک کە شاعیر بە قووڵایی خۆیدا ڕۆدەچێت و زمان



فێر دەکات، کە زام و نیگەرانی و ئەشکەنجە بێت بۆ ئەوەی بتوانێت ببێتە زمانی ئەڤین و زمانی مرۆڤ.

بەمجۆرە شیعرەکانی خۆشەویستی بووە و لە ئازار جیا نابێتەوە. ئازارە و ئەویش بۆ خۆی لە ئەڤین جیانابێتەوە.

٦- ئەمە بوو، کە شیعریشی چەشنی شەخسی خۆی شەرمن بوو، خەریکبوو وەکو گوڵێکی ناودارستانی پشت پەرژینێک لە دڕک و داڵ، کە بە جیهان ناو دەبرێت، پاشەکشە بکات و ونبێت.

ئەمە بوو، کە سەرپارچە زەوییەکی بچکۆلە دەبزوا. وەلی لەسەر سنوورەکانی پڕ لە ئازاری بەسۆی بوو، کە لە هەموو لایەکەوە ڕەوانە کرابوون.

ئەم شاعیرە کە شیعری دەنووسی وەکو گوڵ ئاسا بۆنی خۆی دەنووسییەوە کە ئەویش "یوسف غصوب"ە.

یوسف غەصوب، یەکێکە لە نێو ئەو شاعیرانەی کە هەوڵیان داوە ئەو ژیانەی کە خودا پێڕاسپاردوون بۆ شیعر بگۆڕن، کە دڵ رایدەسپێرێت ئا ئەوەش "قاپییە داخراوەکانە" لە ڕێگەی شیعر و ئەوەی لە پشت مەرگەوەیە، دەدرەوشێنەوە. لە نێوان قاپییەکانی شیعرماندا باڵایە، ئاوالای بالآیه الُمشرعه العالیه.*

(پاریس، حوزەیرانی ١٩٨٦)

**بەرهەمەکانی:**

- کۆمەڵە شیعر
- قصائد رولى،١٩٥٧
- روراق في الريح، ١٩٥٨
- اغاني مهيار الدمشقي، ١٩٦١
- كتاب التحولات والهجرة مع اقاليم النهار والليل، ١٩٦٨
- المسرح والمريا، ١٩٦٨
- هذا هو اسمن، ١٩٧١
- مفرد بصيغة الجمع، ١٩٧٥
- الطابقات والاوائل،١٩٨٠
- شهوه تتقدم في خرائط الماده،١٩٨٧
- احتفاء بالرشياء الواضحة الغامضة، ١٩٨٨

**لێکۆڵینەوەکان:**

مقدمة للشعر العربى،١٩٧١
زمن الشعر،١٩٧٢
الثابت والمتحول:١٩٧٤-١٩٧٨
ا- الاصول
ب- تاجيل الاصول
ج- صدمة الحداثة
فاتحة لنهايات القرن،١٩٨٠
سياسة الشعر، ١٩٨٥
الشعرية العربية، ١٩٨٥
كلام البدايات، ١٩٨٩
الصوفية والسوريالية، ١٩٩٢



**هەڵبژاردەکان:**

ديوان الشعر العربى (٣بەش، پێشەکی)، ١٩٦٤-١٩٦٨
مختارات من شعر ئەلسەيياب (لەگەڵ پێشەکیدا)
مختارات من شعر يوسف الخال (لەگەڵ پێشەکیدا)، ١٩٦٢
مختارات من شعر شوقى (لەگەڵ پێشەکیدا)، ١٩٨٢
مختارات من شعر الرصافى (لەگەڵ پێشەکیدا)، ١٩٨٢
مختارات من الكواكبى (لەگەڵ پێشەکیدا)، ١٩٨٢
مختارات من محمد عبده (لەگەڵ پێشەکیدا)، ١٩٨٣
مختارات من محمد رشيد رضا (لەگەڵ پێشەکیدا)، ١٩٨٣
مختارات من شعر الزهاوى (لەگەڵ پێشەکیدا)، ١٩٨٣
ئەم شەش کتێبەی دوایی بەهاوکاری خالیده سەعید هەڵاوێرد کراون و پێشەکییان بۆ نووسراوە.

**وەرگێڕدراوەکان:**

الأعمال المسوحية الكاملة لجورج شحادة، ١٩٧٥
الأعمال الشعرية الكاملة لسان- جون بيرس، ١٩٧٦
الأعمال الشعرية الكاملة- ايف بونغرا، ١٩٨٦
هەردوو شانۆگەری (فيدر) ، ١٩٧٥ (الشقيقان العدوان)، ١٩٧٥-راسين.